# چۆن زەکاتی سامانەکەت دەدەیت؟

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

نوسینی
د.عەلی قەرەداغی

وەرگێرانی
لیژنەیەك لە رابیطەی ئیسلامی کورد
لقی سلێمانی




2012

چاپی دووەم

# چۆن زەکاتی سامانەکەت دەدەیت؟

نوسینی: پرۆفیسۆر.د. عەلی محیّدین قەرەداغی

وەرگێڕانی: لیژنەی وەرگێڕانی رابیتەی ئیسلامی کورد

چاپی دووەم
زیادکراو و پوختەکراو

٢٠١٢

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

(وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ)

ناوی کتێب: چۆن زەکاتی سامانەکەت دەدەیت؟
نوسەر: پرۆفیسۆر.د. عەلی محیّدین قەرەداغی
وەرگێڕانی: لیژنەی وەرگێڕانی رابیتەی ئیسلامی کورد
پێداچونەوەی: عومەر عەلی محمد
بەرگ: فەرهاد فایەق
تایپ: نوسینگەی راگەیاندنی دکتۆر عەلی قەرەداغی
چاپ: چوارچرا
چاپی دووەم بەدەستکارییەوە: ٢٠١٢
تیراژ:٢٠٠٠
نرخ: ٢٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن (١١٧) ساڵی ١٩٩٨

# پێڕستی بابەتەکان



چەمکی زەکات و کۆی بابەتەکانی بەخشین لەئیسلامدا ڕەهەندێکی یەکجار مرۆڤ دۆستانەیان هەیەو لای هەموو مرۆڤێکی ویژدان زیندوو بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی بابەتی زەکات و بەخشین بەیەکێك لەپایە گرنگەکانی دێتە هەژمار کردن و وەك ڕەهەندێکی عیبادەتی سەیر دەکرێت و مل پێ نەدانی کەسی مسوڵمان دەخاتە ژێر پرسیارەوەو ڕووبەڕووی هەڕەشەی سەختی دینی دەکاتەوە و ناو و نازناوی مەترسیداری لێ دەنێت.

بۆیە بابەتێکی گرنگی وەك زەکات پێویستی بەوە هەیە بەئاگاهی و شێوەیەکی زانستیانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لەو ڕووەوە کەوەك مافێکی خودا کەوتۆتە سەر مرۆڤی مسوڵمانی دەوڵەمەند بەو شێوەیەیی دیاری کراوە بۆی بیداتە لایەنی پێویست لەهەژارو کەم دەرامەت و لایەنەکانی دیکەی وەرگری زەکات، ئەمەو بۆ هەموو کارێك مرۆڤی مسوڵمان پێویستی بەزانست و زانیاری وردو ویست و ئیرادەی جێبەجێکردن هەیە تابتوانێت مرۆڤێکی نمونەی بێت لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیدا.

بەمانایەکی دیکە بەخشین جگە لەڕەهەندە دینیەکەی وەك عیبادەت مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت لەڕووی دەروونیشەوە دڵ ئارامی و ئاسودەیی دەداتە خاوەنەکەی زانستی دەروونی ئەمەی پشت ڕاستکردوەتەوەو لەمێژە قورئانی پیرۆز ئەم بابەتەی خستوەتە ڕوو وەك دەفەرموێت: **{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ} (٢٧٧) سورة البقرة.**

خوێنەری ئازیز ئەم کتێبەی بەردەستت بەشێکی کەمە لەهەڵەو کۆششە گەورەو بەردەوامەکانی جەنابی دکتۆر عەلی قەرەداغی کەبەڕێزیان زۆر بەوردی و پوختی

قسەی لەسەر زۆربەی ئەو بابەتانە کردوە لەبابەتەکانی زەکاندا، کەرۆژانە دەبنە پرسیاری زۆرینەی مسولمانان، ئەوەی گرنگە بەبایەخەوە سەیری بکرێت لەم کتێبەدا ئەوەیە کەلەزۆر جێگادا بەزمانی دەستەجەمعی قسە دەکرێت و سوود وەرگیراوە لەکۆڕو کۆنگرە تایبەتکراوەکان بەبابەتەکانی زەکاتی هاوچەرخ، لەمەش گرنگتر ئەوەیە کەهەمیشە رای بەهێزو پەسەند خراوەتە روو بەسوود وەرگرتن لەکۆی بابەتەکانی شەریعەت بەتێکڕای مەزهەب و قوتابخانە فیقهیەکانەوە.
بێ گومان ئەمەش بۆ زیاتر لەگەورە زانایەکی وەك جەنابی دکتۆر عەلی قەرەداغی شتێکی چاوەڕوانکراوە کەبەرێزیان زیاتر لەچوار دەیەیە سەرقاڵی بابەتەکانی ئابوریی ئیسلامی و فیقهی موعامەلاتن و هەڵکەوتەیەکی دەگمەن و کەم وێنەی ئەو بوارەیە.
گرنگی و بەپێزی بابەتەکە هۆکار بوو بۆئەوەی لیژنەی وەرگێران لەرابیتەی ئیسلامی کورد هەستێت بەکارێکی لەم شێوەیە بەو ئومێدەی خزمەت بەکتێبخانەی کوردی و تۆی خوێنەری ئازیزیش لێی سودمەند ببیت.

ابوبکر پێنجوێنی
٢٠١١-١٢-٢٠

## پێشەکی نووسەر

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سوپاسی هەمیشەیی و بەردەوام بۆ خوای گەورەو خاوەنی هەموو جیهانیان، بڕژێ بارانی بەزەیی و درودو سڵاوات و سەلامی بێ پایان بۆسەر گیانی پاکی ڕەوانەکراوی یەزدان بەرەحمەت بۆ هەموو جیهانیان، بۆسەر گیانی پاکی کەس و کارو هاوڕێ و هاوەڵان و شوێن کەوتوانی بەگشتی بێ وەستان تاکۆتایی کات و زەمان.

دوای ئەمانە مسوڵمانانی ئازیز:

لەبەرئەوەی زەکات سێیەمین پایەی ئەم ئایینە پیرۆزەیەو هۆکاری پەیوەستی نێوان سامان و کۆمەڵایەتیەکی وایە کەئاینی ئیسلام زۆر گرنگی و بایەخی پێداوە، بۆیە لەزۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ناوی زەکات لەگەڵ ناوی نوێژدا پێکەوە یەکخراوە، سەدان جار لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) باسی زەکات هاتوە، هەرکەس نکوڵی لێ بکات و بەواجبی نەزانێ کافر دەبێ و هەمیشە لەئاگری دۆزەخدا ئەمێنێتەوە، تەنها هەر نەدانی زەکات دەبێتە هۆی پێویستی جەنگ و کوشتار لەگەڵ زەکات نەدەردا، چونکە باوەڕی ڕاستەقینەو برایەتی ئایینی بێ زەکات دان تەواو نابێت، هەروەك دەرنەکردنی زەکات دەبێتە نیشانەی نکولی و بێ بڕوایی، ئەوەتە خوای گەورە دەفەموێت: **{فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ} التوبة١١.**

سەبارەت بەوەی پیاو چاکانی پێشوو ئەم گرنگیەیی بەجوانی تێگەیشتون، بۆیە یەکەم جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ) حەزرەتی ئەبوبکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) بڕیاری جەنگیدا لەدژی ئەوکەسانەی لەئایین هەڵگەڕانەوەو زەکاتیان نەداو پاش جەنگێکی سامناك لەگەڵیاندا، هاتنەوە سەر ڕاستە ڕێبازی ئاینی ئیسلام، هەر بۆیە یەکەم دەوڵەت کەلەپێناوی ئاین و بەرژەوەندی و مافی هەژاراندا

جەنگیوە دەوڵەتی ئیسلامە، لەم گۆشە نیگایەوە دەوڵەتی ئیسلام چاودێری ئەم پایە بەهێزو گرنگەی ئەکردو لەبارەی وەرگرتن و بەخشین و خەرج و دابەشکردنی بەسەر هاولاتیاندا یاسای رێك و پێکی دانابوو، بەلام کاتێ ئیستعماری ستەمکار زۆربەی وڵات و نیشتمانی ئیسلامیان داگیر کردو یاسا دەستکردەکانی خۆیان خستە شوێنی رێبازی ئیسلامی پیرۆز لەزۆرینەی وڵاتانی ئیسلامیدا شەریعەت ون کراو گۆشەگیر بوو، بۆیە لەوکاتەوە ئەم یاسا ماڵیە ئیسلامیە خرایە ئەو لاوەو میری پرسیاری لێ نەکرد، ئیتر مایەوە هەرکەس خۆی و بیروباوەڕەکەی و چاودێری خوای گەورە بەسەریەوە.

لەوەیش سامناك و ترسناك تر بلاوبونەوەی نەزانی و نەشارەزایی و چۆنیەتی دانی زەکات، بەڕادەیەك کەزۆربەی خەڵك لەکاروباری زەکات بێ ئاگا بوون، بەتایبەتی زەکاتی ئەو شمەکانەی پەیوەندیان بەبابەتە هاوچەرخەکانی سەردەمەوە هەیە، وەك: زەکاتی موچەو پشك دانراوە بەرهەم هێنەرەکان و کۆشك و تەلارە گەورەکان و ...هتد. ئینجا لەکاتێکدا کەبەڕێوەبەرایەتی بانکی قەتەری دەولی ئیسلامی داوای دانانی کورتە کتێبێکیان لێ کردم لەبارەی زەکاتەوە بەگشتی و لەبارەی زەکاتی بابەتە هاوچەرخەکانی ئەم سەردەمەی زەکاتەوە، ئەوەبوو لەوەلامدا زۆر دوو دڵ بووم، چونکە لام وابوو کتێبی (فیقه الزکات) دانراوی مامۆستای گەورەو پایە بەرز (دکتۆر یوسف قەرزاوی) بەجۆرێ هەموو کەلێنەکانی پڕکردۆتەوەو لەڕووی رێك و پێکیو پڕو چڕی زانستە بنەڕەتی و بەڵگەو بیروبۆچونەکانیەوە ئەوەندە گشتگیرو هەمەلایەنەیە هیچ مەودای نەهێشتۆتەوە وەلامی ئەو پرسیارانە نەداتەوە، تەنانەت خۆشم ماوەی چەند ساڵێك بەقوتابیانی زانکۆی قەتەرم بەوانە وتۆتەوەو سودێکی زۆرم لێ وەرگرتوە لەو بوارەدا.

بەلاّم لەبەرئەوەی ئەم دانراوە بەنرخەی جەنابی دكتۆر قەرزاوی ئەوەندە هەمەلایەن و چڕوپڕەو پێویستی بەپسپۆڕییە لەلایەك و زۆربەی خەڵكیش حەز بەنامیلكەیەكی كورتی دوور لەفرە راو بۆچون ئەكەن و پێویستیان بەیەك ڕای بەهێزو متمانە پێكراو هەیە بۆ وەلاّمی پرسیارە شەرعیەكان لەلایەكی ترەوە.

سەرە ڕای ئەمانەش مامۆستای بەڕێز ئەو كتێبەی لە ساڵی (١٣٨٩ك) داناوە، كەدوای ئەوە چەند كۆڕو كۆنگرە لەبارەی زەكاتەوە گیراوەو چەند بڕیاری بەكۆمەڵی وادراوە كەبۆتە هۆی بنەبڕكردنی زۆربەی ڕاو بۆچوونە جیاجیاكانی بابەتی زەكات بەتەواوی، یان نزیك لەبنەبڕبوون، ئینجا بۆیە منیش ئەو ئەركەم خستە سەرشانم و وەلاّمی داواكەی بەڕێوەبەرایەتی بانكی قەتەرم دایەوەو ئەم نامیلكەیەم دانا، ئەوەی شایەنی باسە ئێمە لێرەدا سوود لەو بڕیارە تازانە وەردەگرین و دەقەكانیان باس دەكەین لەگەڵ گەلێ سەرچاوەی بڕوا پێكراوی تریش، هەتا سودو كەڵكی تەواو بگەیەنن، بەلاّم كتێبی (فقه الزكاة)ی دكتۆر یوسف قەرزاوی گرنگترین سەرچاوەیەو لەپێش هەموانەوە دائەنرێت.

لەكۆتایدا لەخوای بێ هاوتا داواكارم كاروكردەوەكانمان پاك و بێ خەوش بێ و لێمان وەربگرێت‌و بیانكاتە هۆی ڕەزامەندی خۆی، هیوادارم لەهەموو هەڵەو خوارو خراپیەكی بیرو باوەڕو وتارو كردار بمانپارێزێت(ئامین)

هەرخوای گەورە باشترین و پشت و پەنامانە

**دكتۆر عەلی قەرەداغی**

**دۆحە**

**سەرەتای شەعبانی ١٤١٥ك**

# زەكات لەقورئان و سوننەتدا

## زەكات لەقورئانی پیرۆزدا

وشەی زەكات (الزكاة) وشە لیٚ تاشراوەكانی دەیان جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتون و باسیان لیٚ كراوە، ئەوەتە لەبارەی زەكاتەوە ژمارەیەكی زۆر ئایەت هاتوە، وەك خوای گەورە دەفەرمویٚت:{**وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ**}**البقرة٤٣**. واتە: بەرپیٚك و پیٚكی نویٚژ بكەن‌و زەكات بدەن‌و ملی بەندایەتی لەنویٚژی بەكۆمەڵدا (جەماعەت) لەگەڵ خەڵكانی تردا بۆ خوای گەورە كەچ بكەن.

لەهەندیٚ ئایەتدا زەكات بەسیفەت و رەوشتی بڕواداران باس كراوە، وەك ئەوەی كەخوای گەورە دەفەرمویٚت: {**وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ** }**المؤمنون٤**. واتە: ئەو بڕوادارانەی كەزەكاتی سامانەكەیان بەچاكی ئەدەن، بیٚ گومان گەیشتون بەئاواتی خۆیان‌و دەچنە فیردەوسەوە، هەروەها دەفەرمویٚت:{..**وَالْمُقِيمِينَ الصَّلاَةَ وَالْمُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالْمُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أُوْلَـئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْراً عَظِيماً**}**النساء١٦٢**. واتە: ئەو بڕوادارانەی كەبەجوانی نویٚژ دەكەن‌و زەكات بەپیٚ شیاوان ئەدەن‌و باوەڕیان بەتاك‌و تەنهایی خوای گەورەو رۆژی قیامەت هەیە، ئەوانە ئیٚمە پاداشتی چاكەیان ئەدەینەوە، وەدەفەرمویٚت:{....**وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ** }**البقرة٢٧٧**. واتە: ئەو بڕوادارە كردەوە چاك‌و نویٚژكەرو زەكات دەرانە بیٚگومان پاداشتیان هەیە لای پەروەردگاریان.

لەهەندیٚ ئایەتدا زەكات كراوە بەمەرج بۆ باوەڕو چونە بەهەشت‌و برایەتی بڕواداری‌و وەرگرتنی تۆبەو لابردنی گوناهەكان، وەك خوای گەورە ئەفەرمویٚت:

{.....**لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلاَةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللّهَ قَرْضاً حَسَناً لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ** ........ }**المائدة١٢**. واتە: سوێند بەگەورەیی و بێ هاوتایی خۆم، ئەگەر ئێوە بەرێكو پێكی نوێژتان كردو زەكاتتان داو بڕواتان بەپێغەمبەرانی من كردو یارمەتیتان دانو هەروەك قەرز بەخوای گەورە بدەن بەبێ منەتو روشكاندن دەستگیرۆیی خەڵكتان كرد، منیش لەپاداشتی ئەوەدا چاوپۆشی لەخراپەكانتان دەكەمو رۆژی دوایی ئەتانبەمە ئەو بەهەشتو باخانەی كەرووباری ئاوی پاكو رونیان پێدا دەڕوا.

هەروەها لەئایەتێكی تردا دەفەرموێت:{**فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ**}**التوبة١١**. واتە: ئەگەر كافران تۆبەیان كردو وازیان لەكوفرو پەیمان شكاندن هێناو نوێژیان كردو زەكاتیان دەركرد، ئیتر دەبنە برای ئاینی ئێودو لەهەموو مافو ئەركێكدا وەك یەك ئەبن.

خوای گەورە لەهەندێ ئایەتدا رونی كردۆتەوە كەماڵو سامان بەهۆی زەكات لێدانەوە كەم ناكات، بەڵكو پیتو بەرەكەتی تێدەكەوێت. خوای گەورە دەفەرموێت:{..... **وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ** }**الروم٣٩**. واتە: ئەو ماڵەی ئێوە ئەیدەن بەزەكات تەنها لەبەر رەزای خوای گەورە، بێ گومان ئەو كەسانەی زەكاتەكە ئەدەن خاوەنی چەندجارە پاداشتو پیتو بەرەكەتیش ئەكەوێتە سامانەكەیانەوە.

لەلایەكی تریشەوە خوای گەورە باسی كافرو بت پەرستەكانی كردوەو هەڕەشەی لێ كردون بەوەی كەزەكات نادەن، دەفەرموێت:{......**وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ، الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ** }**فصلت٦-٧**. واتە: سزای سەختی

دوارۆژ بۆ بت پەرستان، ئەوانەی زەکاتی سامانەکەیان نادەنو بڕوای تەواویان بەزیندوبونەوەی دوای مردن نیەو هیچ سۆزو دڵنەرمیەکیان بۆ هەژاران نیە.

## گشتگیری وشەی (الزکاة) بۆ سامانو دەرون:

قورئانی پیرۆز وشەی زەکاتی بەکارهێناوە لەپاککردنەوەی ماڵو ساماندا بەتایبەتی چەمکی (**الزكاة**) وەك لەو ئایەتەی کەرابوردن، ئەمەیش لەکاتێکدا کەوشەکارییەکانی (فعله)کانی لەخاوێن کردنەوەی دڵو دەرونا بەکارهێناوە لەچەند ئایەتی تردا، لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: {**قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا** } **الشمس٩**. واتە: بەراستی کەسانێ سەرکەوتنو بەهرەمەند بون کەدەروونی خۆیان پاكو گەشەدار کردو لەخەوشو خراپە رزگاریان کرد، وەزیانو رۆچونیش بۆ ئەوانەی بەهەوەسو نارەزوکاری خۆیان خستە پلەی ئاژەڵو دەروون پاکیو ژیرییەکەی خۆیان لەدەستدا. وەئەفەرموێت: {**خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ** }**التوبة١٠٣**. واتە: ئەی پێغەمبەر لەماڵو سامانی مسوڵمانەکان وەربگرەو ببیبەخشە بەهەژاران، بۆ خاوێن کردنیان لەخراپەو گەشەپێدانی دەرونیان و دوعای خێرو چاکەیان بۆ بکە.

هەروەها دەفەرموێت: {**كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ** }**البقرة١٥١**. واتە: وەك ئەوەی نازو نیعمەتی تەواوم پێدان هەروەها پێغەمبەرم لەخۆتان بۆ ناردن هەتا ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەرا بخوێنێتو بەرەو چاکەو دڵ پاکی بتانگۆڕێ.

هەروەها دەفەرموێت: {**هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ**

مُبِينٍ} الجمعة٢.واتە:ئەو خوايەی لەناو نەخوێندەوارەکاندا پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری لەخۆيان بۆ رەوانە کردونو ئايەتەکانی خوايان بەسەردا ئەخوێنێتو دڵو دەرونيان خاوێن ئەکاتو قورئانو زانستی بەسوديان فێر دەکات، خۆ گومانيش لەوەدا نيە کەئەوان پێش ئيسلام بەتەواوی لەرێگای راست و دروست سەرگەردان بوون.

خوای گەورە رونی کردۆتەوە ئەو کەسانە سەرکەوتون کەدڵو دەرونی خۆيان لەهەموو خەوشو رەوشتێکی نارەوا خاوێن کردۆتەوەو زەکاتی سامانەکەيان بەچاکی ئەدەن کەئەفەرموێت: {قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى } الأعلى١٤. وەپاکو خاوێن کردنی سامانو دڵو دەروونی يەکخستوەو لەگۆشە نيگايەکەوە سەيريان دەکات. کەدەفەرموێت:{وَسَيُجَنَّبُهَا الأَتْقَى، الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى }الليل١٧-١٨.

واتە: ئەو کەسە لەدۆزەخەوە دوور ئەبێت کەبەچاکی خواپەرستی ئەکاتو ماڵو سامان لەخێرو چاکەدا خەرج دەکاتو لەهەمان کاتدا دڵو دەرونی لەخەوشو خووە گەندەکان خاوێن دەکات.

ديارە کۆکردنەوەی ئەم دوو جۆرە پاکسازييە لەگشتگيری ئيسلامی پيرۆزەوە سەرچاوەی گرتوەو لەبەخۆ گرتنی پەروەردەکەيەوە بۆ هەموو لايەنێکی مرۆڤو ژيان هەڵدەقوڵێت، بەو نيازەی کەمرۆڤ بژی بەژيانێکی لەخوا نزيكو دوور لەو کەسيەتە دووبەشو دوڕيەيە کەئێستا ئەم چەرخەی ئێمەی تيا ئەژی.

کەواتە مرۆڤی باوەڕدار وەك ئەبێ سامانەکەی خاوێن بکات بەزەکات لێ دەرکردن، دەبێ باشتر دڵو دەرونی خۆی پاكو خاوێن بکات لەنەخۆشيە دەرونيەکانو کردەوەو رەوشتە ناپەسەندەکانی وەك: رق و حەسودی و خۆبەگەورە زانينو لەخۆ بايی بوون و پێشێل کردنی مافی خەڵکیو فروفێڵ کردنو هەموو خوارو خێچيەك، لەراستيدا بڕوای تەواوی راستەقينە کاتێ بەدی دێت کەمرۆڤ

پەیوەندی بەخوای گەورەوە توندو بەهێز بێتو دڵو دەرونی بەڕەزای خواوە بەسترا بێتو گیانو ماڵو سامانی بۆ خوای گەورە تەرخان کردبێتو خۆی لەهەوەس کاریو ئارەزوو بازی خاوێن بکات، بەڵکو دەبێ هەموو ئارەزووەکانی بەپێی ئیسلامو بەرنامە پیرۆزەکەی خوای گەورە بێت.

وشەی (**الصدقة**) وداتاشراوەکانی زیاتر لە (١٥٠) سەدوپەنجا جار لەقورئانی پیرۆزدا دوبارە بۆتەوەو ئەمیش وەك وشەی (**الزكاة**) وشەیەکی پڕ واتاو ناوازەیە، چونکە ئەم لایەنانە ئەگرێتە خۆ: راستو دروستی کارو کردەوە، کەئەویش بەزەکات دەرکردنو خێرو چاکە کردن دەردەکەوێت، هەروەك راستو دروستی وتەو بیرو باوەڕ ئەگرێتە خۆ، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر جەخت کردنی ئاینی ئیسلام لەسەر پەروەردەی هەمە لایەنەی راستو دروست کردنی تاکی رێكو پێکی تەواو لەکۆمەڵدا.

## <u>زەكات لەسوننەتدا:</u>

قورئانی پیرۆز چۆنیەتی زەکات دانو ئەو جۆرە شتانەی کەدەبێ زەکاتیان لێ بدرێتو مەرجەکانو پایەکانی زەکاتی بەدرێژی باس نەکردووە، بەڵکو ئەوانەی هەموو هێشتۆتەوە بۆ ڕێو رەسمێ کەپێغەمبەری خۆشەیست(درودی خوای لەسەر) بەجوانی رونی کردۆتەوەو لەشاری مەدینەی پیرۆز بەکاری هێناوەو زەکاتی کردووە بەشادەماری ئابوریی یەکەم دەوڵەتی ئیسلام، بۆیە لەم بارەیەوە ژمارەیەکی زۆر فەرموودە هەیە، بەڵام لێرەدا هەندێ لەو فەرمودانە باس دەکەین کەمامۆستا (دکتۆر یوسف قەرزاوی) لەکتێبی (**النتقی**) دا بەراگواستن لەکتێبی (**الترغیب والترهیب**) دانراوی (**الحافظ المنذري**) یەوە وەری گرتوون و گەلێ پەراوێزی بەنرخی لەسەر نوسیون، وەك: ( **عن ابي هريرة وابى سعد الخدرى ( رضي الله**

**عنهما ) قالا : خطبنا رسول الله صلى الله عليه وسلم ( يوما )، فقال: والذي نفسي بيده ( ثلاث مرات ) ثم اكب، فاكب كل رجل منا يبكي لايدري على ماذا حلف؟ ثم رفع رأسه وفي وجهه البشرى، فكانت احب الينا من حمر النعم. ثم قال: ومامن عبد يصلي الصلوات الخمس ويصوم رمضان ويخرج الزكاة، ويجتنب الكبائر السبع الا فتحت له ابواب الجنة، وقيل له : أدخل بسلام ) راوه النسائي واللفظ له، وابن ماجه، وابن خزيمة، وابن حبان في صحيحهما، والحاكم وقال: صحيح الاسناد. ووافقه الذهبي ( ١/٢٠٠ ) وفي اخره: ثم تلا : {إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً }النساء٣١**

واتە: ئەبوهریرەو ئەبو سەعیدی (خدری) رەزای خوایان لێ بێت، وتیان: رۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) وتارێکی پێشکەش کردین و سێ جار فەرمووی: سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ئیتر وەستاو سەری دانەواند، ئینجا هەریەکە لەئێمەش سەری خۆی نەوی کردو دەستی کرد بەگریان، نەماندەزانی لەسەر چی سوێندی خوارد. پاشان سەری هەڵبڕی و بەجۆرێ موژدەو خۆشی لەرووی پیرۆزی دەبینرا ئەگەر هەریەکەمان گەلە حوشترێکی سوری (کەباشترینماڵی عەرەبە) دەس بکەوتایە ئەوەندە خۆشحاڵ نەدەبوو، ئینجا فەرمووی: هەرکەس لەبەندەکانی خوا پێنج نوێژە فەرزەکە بکات و، رۆژووی مانگی رەمەزان بگرێت و، زەکاتی سامانەکەی بدات و، لەحەوت گوناهە گەورەکان دووربکەوێتەوە، بێ گومان هەموو دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوەو پێی دەڵێن: فەرموو لەکام دەرگاوە پێت خۆشە بچۆرە ژوورەوە. ئەم فەرمودەیە نەسائی بەم بێژەیە گێڕاویەتیەوە. وەئیبن ماجەو ابن خوزەیمەو ئیبن حەببانیش گێڕاویانەتەوە، حاکمیش گێڕاویەتیەوەو فەرمویەتی: رشتەکەی ڕاستە(زەهەبیش پەسەندی کردووە، هاوڕای حاکمی کردوە) (١/٢٠٠)

لەکۆتایی فەرمودەکەدا هاتوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندوە:{**إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً**} **النساء٣١**.

**وعن انس بن مالك رضي الله عنه قال: أتى رجل من تميم رسول( صلى الله عليه وسلم ) فقال: يارسول الله! انى ذو مال كثيرو ذو اهل ومال، وحاضرة، فأخبرني كيف أصنع، وكيف أنفق؟ فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ( تخرج الزكاة من مالك فانها طهرة تطهرك، وتصل أقرباءك، تعرف حق المسكين، والجار، والسائل.... ) الحديث رواه احمد، ورجاله رجال الصحيح.**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خوای لیّ بیّت وتی: پیاوێك لەهۆزی تەمیم هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من خاوەنی ماڵێکی زۆرو خزمو کەسو کارو خانوبەرەمو نیشتەجێم، پێم بڵێ چۆنو چی بکەم و چۆن لەماڵەکەم ببەخشم؟ پێغەبەر(ﷺ) فەرمووی: زەکاتی ماڵەکەت ئەدەیت، چونکە ئەوە پاکت ئەکاتەوە لەخراپە، وەهاتووچۆو دەسگیرۆیی خزمەکانت ئەکەیتو ئاگات لەمافی هەژارو دراوسێو سوالکەر ئەبێت ... تاکۆتایی فەرمودەکە. ئەم فەرموودەیە ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو پیاوانی ڕشتەکەشی پیاوانی بێژە دروستن.[2]

**(وعن عائيشة رضي الله عنهما. ان رسول الله صلى الله عليه وسلم. قال: ثلاث أحلف عليهن: لايجعل الله من له في الاسلام كمن لاسهم له، وأسهم الاسلام ثلاثة: الصلاة، والصوم، والزكاة، ولايتولى الله عبدا في الدنيا فيوليه غيره يوم القيامة... الحديث) رواه احمد باسناد جيد. ونسبه في**

---

[1] - ونسبه في مجمع الزوائد الى الطبراني أيضا، وقال: رجاله رجال الصحيح. (٦٣/٢)

[2]– خاوەنی کتێبی (مجمع الزوائد) لە(تەبەرانی)یەوە گێڕاویەتەوە کە وتوشیەتی ڕشتەکەی ڕاستو ڕەوا بێژن.

**الجامع الصغير الى النسائي والحاكم، والبيهقي في الشعب أيضا من حديث عائيشة، وذكر شارحه المناوى: أن في اسناده مقالا، والى عبد الرزاق عن ابن مسعود، والى الطبراني عن ابي امامة، ونقل المناوى عن الهيثمي ان رجاله ثقاة)** (الفيض ٢٩٨/٣).

واته: دایکی بڕواداران حەزرەتی عائیشە رەزای خوای لیٚ بیٚت وتی: پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مـن لەسەر سیٚ شت سوێند ئەخۆم: کەسیٚ کەبەشی لەئیسلامدا هەبیٚتو کەسیٚ بەشی تەنیا نەبیٚت خوای گەورە لەیەك پلەوپایەدا دایان نانیٚتو بەشەکانی ئیسلامیش سیانن، نوێژە فەرزەکان و-ڕۆژوی مانگی رەمەزانو زەکات دەرکردن) ئەوکەسەی خوای گەورە لەدونیادا خۆی چاودێری بکات هەرگیز لەقیامەتدا بەرەو رووی یەکیٚکی تری ناکاتو دەسبەرداری نابیٚت.... تاکۆتای فەرمودەکە. ئەم فەرمودەیە ئەحمەد بەرشتەیەکی چاکەوە گیٚراویەتیەوە. لەکتیٚبی (الجامع الصغير) دا گیٚرانەوەی ئەم فەرمودەیە لەنەسائیو حاکمەوە باس کراوە. وەلەبەیهەقیەوە لەشوعەبدا هەروەها لەعائیشەوە. مەناوی راڤەکەری فە رمودەکە دەڵیٚ: رشتەکەی قسەی لەسەرە. وەئەم فەرموودەیە عبدالرزاق لەئیبن مەسعودەوە گیٚراویەتیەوە وە طەبەرانیش لەئەبو نوماوە. مەناوی لەهەیسەمیەوە راگوێزی کردوە کەپیاوانی فەرمودەکە متمانە پیٚکراون. (**الفيض** ٢٩٨/٣).

**لەبارەی هەڕەشە لەزەکات نەدەران** ئەم فەرموودانە باس دەکەین کەلەدواوە دێن:-

(**عن ابي هريرة – رضي الله عنه- قال: قال النبي(ﷺ): مامن صاحب ذهب ولا فضة لايؤدي منها حقها الا اذا كان يوم القيامة صفت له صفائيح من نار فاحمي عليها في نار جهنم، فيكوى بها جنبه**

وجبينه وظهره، كلما بردت اعيدت له في يوم كان مقداره خمسين الف سنة حتى يقضى بين العباد، فيرى سبيله اما الى الجنة واما الى النار. قيل يارسول الله: فالابل؟ قال ولا صاحب ابل لايؤدي منها حقها - ومن حقها حلبها يوم وردها - الا اذا كان يوم القيامة بطح لها بقاع قرقر، أوفر ماكانت لايفقد منها فصيلا واحدا تطؤه بأخفافيها، وتعضه بأفواها، كلما مر عليه اولاها رد عليه اخراها، وفي يوم كان مقداره خمسين الف سنة حتى يقضي بين العباد، فيرى سبيله اما الى الجنة واما الى النار، قيل يارسول الله، فالبقروالغنم؟ قال: ولاصاحب بقر ولا غنم لايؤدي منها حقها الا اذا كان يوم القيامة بطح لها بقاع قرقر أوفر ماكانت لايفقد منها شيئا ليس منها عقصاء ولاجلحاء ولا غضباء، تنطحه بقرونها وتطؤه باضلافيها كلما مر عليه أولاها رد عليه اخراها، في يوم كان مقداره خمسين الف السنة، حتى يقضى بين العباد فيرى سبيله اما الى الجنة واما الى النار، قيل: يارسول الله، فالخيل؟ قال: الخيل ثلاثة: هي لرجل وزر، وهي لرجل ستر، وهي لرجل اجر، فأما التى هي له وزر. فرجل ربطاها رياء وفخرا ونواء لاهل الاسلام، فهي له وزر، اما التي له ستر، فرجل ربطها في سبيل الله، لم ينس حق الله في ضهورها ولا رقابها، فهي له ستر، وأما التي هي له أجر، فرجل ربطها في سبيل الله لاهل الاسلام في مرج أو روضة، فما أكلت من ذلك المرج أو الروضة من شيء الا كتب له عدد ما اكلت حسنات، وكتب له عدد أرواثها وأبوالها حسنات، ولا تقطع طولها فاستنت شرف أو شرفين الا كتب له عدد أثارها وأرواثها حسنات ولا مربها صاحبها على نهر فشربت منه، ولايريد أن يسقيها، الا كتب الله له عدد ماشربت حسنات قيل يارسول الله، فالحمر؟ قال: ماأنزل على في الحمر الا هذه الاية الفاذة الجامعة: {فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَراً يَرَهُ }الزلزلة٧-٨. رواه البخاري ومسلم، واللفظ له، والنسائي مختصرا ).

واتە: ئەبوهورەیرە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت، هەرکەسێك خاوەنی زێڕو زیوی پلە زەکات بیّو زەکاتەکەی نەدا، رۆژی زیندوو بونەوە لەدۆزەخدا زێڕوزیوەکەی لەسەر پارچەی ئاگر سور دەکرێتەوەو تەنیشتو تەوێڵو پشتی پیّ داخ دەکرێت، هەرکەساردیش بوەوە هەمیسان بۆی سور دەکرێتەوە، ئیتر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە لەرۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا کۆتایی دادگای کردنی نێوان بەندەکانی خوا، ئینجا یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ ئەکەوێتە ریّ. عەرزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا، ئەی لەبارەی وشترەوە چی دەفەرموی؟ فەرموی: هەرکەسێکی خاوەن وشتر مافی هەژارانی لیّ نەدا، تەنانەت لەو شیرەش کەلەرۆژی ئاوەدانیدا لێی ئەدۆشیّ، ئەوە لەرۆژی قیامەتا لەدەشتێکی رووتەنو ساڤدا ئەو خاوەنەی بەلەپەو روودا ئەخرێت وشترەکانی بیّ کەمو کورتی تەنانەت بەچکەیەکیشیان لیّ کەم نابێتو هەموو لەوپەڕی بەهێزی و قەڵەویدا بەسەریا دەڕۆنو بەسمەکانیان پانی دەکەنەوەو بەدەمیش گازی لیّ دەگرن، هەموو بەسەریدا دەڕۆنو بەسەریدا دەگەڕێنەوەو پانی دەکەنەوە لەرۆژێکا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا لەنێوان بەندەکانا دادگایی تەواو دەبیّ، ئەوسا یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ دەیخەنە ریّ. وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی لەبارەی رەشە ولاّخو مەڕوبزنەوە چی؟ فەرمووی: ئەو کەسەی خاوەنی ئاژەڵ (مەڕو بزنو رەشە ولاّخ) بێتو مافی هەژارانی لیّ نەدا، لەرۆژی قیامەتدا لەدەشتێکی رووتەندا لەسەردەم دەخرێتو هەموو ئاژەڵەکان بیّ یەك دانە کەم، هەموو لەجۆشی قوەتو هێزو قەڵەویداو نەشاخ چەمیوێك **(عقباء)** و نەکوڵێكو **(جلحاء)** نەشاخ شکاوێکیان**(عضباء)** تیا نابێت هەموو بەردەوام بەسەریدا دەچنو دەگەڕێنەوەو پانی دەکەنەوەو شۆقی لیّ ئەدەن بەدرێژای رۆژێك کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵ دەبێت، هەتا لەنێوان بەندەکانا بەتەواوی دادگەری دەکرێت، ئەوسا یان بۆ بەهەشت

یان بۆ دۆزەخ دەکەوێتە ڕێ. وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی لەبارەی ڕەوەی ولاخی بەرزەوە چی؟ فەرمووی: بەرزە ولاخ سێ جۆرە، هەیانە دەبێتە مایەیی تاوان و خراپە بۆ خاوەنەکەی، یان داپۆشەری خراپەو گوناهیەتی، یان بۆی دەبێتە هۆی پاداشتی چاکە، واتە: ئەگەر کابرا ولاخە بەرزەکەی بۆ ڕووپامایی و خۆنواندنو شانازی پێکردنو دوژمنایەتی (**نواء**) پێکردنی مسوڵمانان ڕاگرتبێ، ئەوە باری گوناهە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر خاوەنەکەی بۆ ڕێی خوا ڕای گرتبێو مافی خوا لەپشتو گەردنیا لەبیر خۆی نەباتەوەو لەبەر ڕەزای خوا یارمەتی خەڵکی پێ بدات، ئەوە بۆی دەبێتە پۆشینی گوناهـ و خراپەکانی، وەئەو کەسەی بەرزە ڕابگرێت لەپێناوی ئیسلام و تێکۆشان لەڕێی خواداو بەخێوی بکات لەمێرگ یان باخو بێستانێکدا، ئەوە بەقەد ئەوەندەی لەو مێرگە یان لەو باخە بخوات چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت، تەنانەت بەقەد میزو تەرسەکەشی چاکەی بۆ دەنوسرێت، وەهەرکات مەڕبەندەکەی، یان پەتی بەستنەوەکەی، یان ڕەشمەکەی (**طول**) بچڕاندو خێرا ماوەی میلێك یان دوومیل دوورکەوتەوەو بەغاردان یاری کرد، ئەوە بەقەد شوێن پێکان، تەرسەکان، چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت، وەهەرکات خاوەنەکەی ڕۆیشتو بردی بەسەر ڕووبارێکداو ولاخەکەی ئاوی لێ خواردەوە، بابەنیازی ئاودانیشی نەڕۆیشتبێ، ئەوە هەرچەندێ ئاو بخواتەوە ئەوەندە چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێ. وترا ئەی لەبارەی گوێ درێژەوە چی دەفەرموی؟ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من لەبارەی زەکاتی گوێ درێژەوە هیچ نیگایەکم بۆ نەهاتووە، ئەم ئایەتە پڕ ماناو گشتگیرە نەبێت: {**فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَراً يَرَهُ** } **الزلزلة٧-٨**. واتە: هەرکەسێ بەقەد گەردیلەیەك کردەوەی چاکە بکات پاداشتی خۆی ئەبینێتەوە، وەهەر کەسێك بەقەد

گەردیلەیەك خراپە بكات سزاكەی دەبینێتەوە. ئەم فەرمووودەیە بوخاریو موسلیم گێراویانەتەوە. تەمە بێژەی موسلیمە نەسائیش بەكورتی گێراویەتیەوە.

**عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ) : ان الله فرض على أغنياء المسلمين في اموالهم بقدر الذي يسع فقرائهم ولن يجهد الفقراء اذا جاعوا وعروا الا بما يصنع اغنيائهم، الا وان الله يحاسبهم حسابا شديدا ويعذبهم عذاباء اليما (رواه البطراني في الاوسط والصغير، وقال: تفرد به ثابت بن محمد الزاهيد، قال الحافظ المنذري: وثابت ثقة صدوق، روى عنه البخاري وغيره، وبقية رواته لابأس بهم وروى موقوفا على علي رضي الله عنه وهو أشبه.)**

واته: عەلی (ڕەزای خوای لیٚ بێت) وتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت: خوای گەورە لەسەر مسوڵمانە خاوەن ماڵو سامانەكانی پێویست كردووە ئەوەندەی كەبەشی ژیانی هەژارەكانیان بكات، وەكەهەژارە مسوڵمانەكان بیٚ هێزوو ماندوو نەبن كاتی برسێتی و رووتەڵیان هەربەهۆی كردەوەی خراپو رژدی دەوڵەمەندەكانەوەیە ، دەبا دەوڵەمەندە چروكەكان باش بزانن كەخوای گەورە رۆژی قیامەت بەتوندی پرسیاریان لیٚ دەكاتو سزای زۆر سەختو بەنازاریان ئەدات. ئەم فەرمودەیە طەبەرانی لەهەردووكتێبی (الاوسط) و(الصغیر)ی دا گێراویەتیەوەو دەفەرموێت (تەنها سابتی كوری محمد الزاهد) گێراویەتیەوە. (حافظ المنذري) دەڵێ: ثابت پیاوێكی راستو متمانە پێكراوەو بوخاریو خەڵكی تریش فەرمودەیان لیٚ گێراوەتەوە، گێرەرەوەكانی تریش ردخنە لیٚ گیراو نین، ئەم فەرمودەیە بە (مەوقوفی) لەحەزرەتی عەلیەوە گێردراوەتەوە، واش نزیكترە لەقەبول.

**وعن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: أمرنا باقام الصلاة وايتاء الزكاة، ومن لم يزك فلا صلاة له. رواه الطبراني في الكبير موقوف هكذا**

**بأسانيد احدهما صحيح والاصبهاني وكذالك قال الهيثمي في مجمع الزوائد (٦٢/٣ )**[٢]

واته: عەبدولاّی کوری مەسعود (رەزای خوای لیّ بیّت) وتی: فەرمانمان پیّکراوە کەبەجوانی نویّژ بکەین‌و زەکات بدەین وەئەوکەسەی زەکات نەدا نویّژەکەشی بیّ سودە. (ئەم فەرمودەیە ) طبەرانی لەکتیّبی (الکبیر) دا ئاوا بەمەوقوفی بەچەند رشـتە گیّراویەتیەوە، وەیەکیّکیان (صحیح) ە راستەو، وەئەصبەهانیش گیّراویەتیەوە.

**وعن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي (ﷺ) قال: من اتاه الله مالا فلم يؤد زكاته، مثل له يوم القيامة شجاعا أقرع له زبيبتان يطوفه يوم القيامة ثم ياخذ بلهزمتيه، يعني شدقيه، ثم يقول: أنا مالك أنا كنزك. ثم تلا هذه الاية {وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْراً لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ }آل عمران١٨٠)**

واته: لەئەبوو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّت پیّغەمبەر (ﷺ)دەفەرمویّت: ئەوکەسەی خوا مالّی بداتیّ‌و زەکاتەکەی نەدا، رۆژی قیامەت مالّەکەی دەبیّتە نیّرە ماریّکی کەچەلّی تەمەن دریّژی زۆر پیس‌و دەم پڕ لەژار، کەدوو خالّی رەش بەسەر چاوەکانیەوەیەو لەکابرا دەئالّیّ‌و ئینجا هەردوو لغاوەی دەگریّ‌و دەی گەزیّ‌و پیّی دەلّیّ: من مالّەکەتم، من گەنجینەو خەزنەکەتم، پاشان پیّغەمبەر (ﷺ)، ئەم ئایەتەی خویّندەوە **{وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْراً لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ }آل عمران١٨٠)**

---

[٢]- وەهەیسەمیش وای فەرموە لەکتیّبی (مجمع الزوائد) ٦٢/٣

واتە: خاوەنماڵو چروكو رژدەكان واگومان نەبەن كە .....هتد. ئەم فەرمودەیە بوخاری موسلیمو نەسانی گێراویانەتەوە.

**وعن بريدة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلي الله عليه وسل: ( سامنع قوم الزكاة الا ابتلاهم الله بالسنين ) رواه الطبراني. في الاوسط ورواته ثقات والحاكم والبيهقي في حديث الا انهما قالا : ولا منع قوم الزكاة الا حبس الله عنهم القطر. وقال الحاكم: صحيح على شرط مسلم[4]**

واتە: بورەیدا رەزای خوای لێ بێت وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەر كۆمەڵێك زەكات نەدەن، بێ گومان خوای گەورە توشی رەشەساڵو قاتو قڕیان دەكات، ئەم فەرمودەیە طەبەرانی لەكتێبی (الاوسط) ی گێڕاویەتیەوە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە بڕوا پێكراون، وەحاكم بەهەیقیش لەفەرمودەیەكدا گێڕاویانەتەوە، بەلآم بەم شێوەیە: (ولا منع قوم الزكاة الا حبس الله عنهم القطر) واتە: هەركۆمەڵێك زەكات نەدەن خوای گەورە بارانیان لێ ئەگرێتەوەو، تووشی قاتو قڕیان دەكات. حاكم دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە راستە، بەپێی مەرجی مسلم.

**ورواه ابن ماجه[5] والبراز والبيهقى من حديث ابن العمر[6] ، ولفظ البيهقي ان رسول الله (ﷺ) قال: يامعشر المهاجرين، حصال خمس ان أبتليتم بهن ونزلن بكم اعوذ باالله ان تدركوهن: لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا كبها الا فشا فيهم الاوجاع التي لم تكن في اسلافهم ، ولم ينقصوا الميكال والميزان الا أخذوا بالسنين وشدة المؤنة: وجور السلطان ولم يمنعوا زكاة اموالهم الا منعوا القطر من السماء، ولولا البهائم لم يمطروا ولا**

---

٤– ووافقه الذهبي (١٦٢/٢) هەیسەمیش وای وتووە.

[5]– وهو الحديث ٤٠٩١ من طريق ابن ابي مالك عن ابيه، وفي الزوائد: هذا حديث صالح للعمل به، وقد اختلفوا في ابن أبي مالك وابيه

[6]– رواه ابن حاكم ايضا وصحح اسناده ووافقه الذهبي ٤/٥٤٠- ٥٤١.

**نقضوا عهد الله وعهد رسول الا سلط عليهم عدوا من غيرهم فيأخذ بعض مافي أيديهم مالم تحكم أئمتهم بكتاب الله الا جعل بأسهم بينهم**[٧]

واتــه: ئـيبن ماجـەو بـەررازو بەيهـەقى لەفەرمودەيەكـدا كەلـەئيبن عومـەرەوە، وەبێژەكەى بەيهەقيش بەم شێوەيە دەڵێ كە: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، دەفەرموێت: ئەى كۆمـەڵى كۆچ كەران بێدار بن، پێنج رەوشتى گەلێ بەدو خراپ هەن، پـەنا بـەخواى گەورە ئەگرم كە ئێوە بيانگرنە خۆ، ئەگەر لەكاتى ژيانى ئێوەدا روويانداو ئێقـەيان پـێ گـرتن، قـەت نـەبوە كەلـەهيچ گـەلو كۆمـەڵێكـدا داوێـن پيـسى دەركـەوێت، بەرادەيـەك كـەخۆيان ئاشـكراى بكـەنو راى بگەيـەنن بـێ گومـان جـۆرە دەردو ئازارێكيـان تـووش هـاتوە كەلەپێشينەكاندا رووى نـەداوە، كەلـەپێوانو كێشاندا دزيان كردبێت، ئـەوا توشـى سـالآنى سـەختو گرانـىو زۆرو سـتەمى كاربەدەست بـوون، وەكەلـەدەركردنى زەكـاتى سـامانەكەيان نكۆڵيـان كردبـێو نەيانـدابێ ئـەوا تووشى قاتو قڕىو وشكە ساڵى بون، ئەگەر ئاژەڵى بێ زمان نەبوايـە بارانيـان بـۆ نـەدەبارى، وەكـاتێ بـەڵێنو پـەيمانى خـواو پێغەمبـەرى خوايـان شـكاندبێ ئەوسـا دوژمنێكى بيانى بەسەرياندا زاڵ بوەو ئەو شتەكەمەى كەلەدەستيانا بووبێ ئەويش لێى زەوت كردوون، وەهەركات پێشەواكانيان بەرنامەى خواى گـەورەيان پـێ كـارو پيادە نەكردبێ ئەوا تووشى خۆخۆرىو براكوژى ناوخۆى بوون.

**وعن الاحنف بن قيس رضي الله عنه قال: جلست الى ملا من قريش، فجاء رجل خشن الشعر والثياب والهيئة حتى قام عليهم فسلم، ثم قال: بشر الكانزين برضف يحمي عليه في نار جهنم، ثم يوضع على حلمة ثدي احدهم حتى يخرج من نفض كتفه، ويوضع على نفض كتيفية حتى يخرد من حملة**

---

[٧] ـ ئەم فەرمودەى ژمارە ٤٠٩١ كەلەرێگەى (ابن ابى مالك) لەباوكيەوە گێڕاويەتيەوە، وەلەزەوائيدا دەڵێ: ئەم فەرمودەيە شياوى كار پێكردنە، بەڵام ڕاوبۆچونى جياوازە لە (ابن ابى مالك) و باوكيدا . (٤) حاكميش گێڕاويەتيەوە. رشتەكەشى بەلاوە راستە، زەهەبيش پەسەندى كردووە هاوڕايەتى (٤/٥٤٠-١٥٤٠)

**الثدية، فيتزلزل، ثم ولى فجلس الى سارية، وتبعته وجلست اليه، وانا لأدري من هو، فقلت له: لا ارى القوم الا قد كرهوا الذي قلت، قال: انهم لايعقلون شيئا، قال: خليلي، قلت من خليلك؟ قال: النبي(ﷺ) قال يا ابا ذر: أتبصر أحدا؟ قال: فنظرت الى الشمس مابقي من النهار. وانا أرى أن رسول الله (ﷺ)يرسلني في حاجة له قلت: نعم، قل: ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا أنفقه كله الا ثلاث دنانير. وان هؤلاء لايعقلون، انما يجمعون الدنيا. لا والله أسألهم دنيا، ولا أستفتيهم عن دين حتى ألقي الله عزوجل. رواه بخاري ومسلم.**

واتە: لەئەحنەفی کوڕی قەیسەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەگێڕنەوە کەوتی: جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك لەگەڵ پیاو ماقوڵانی قورەیش دانیشتبووم، پیاوێکی موو گرژی دیمەنو بەرگ زبر هاتو بەدیاریانەوە وەستاو سەلامی کردو ئینجا وتی: مژدە لەخاوەن غەزنەو دەوڵەمەندەکان(ئەوانەی کەمافی شەرعی زەکات نادەن) بەبەردێ (نصف) کەلەئاگری دۆزەخ گەرم ئەکرێتو سور ئەبێتەوە، ئینجا ئەخرێتە سەر گۆی مەمکی هەریەکێکیان وای ئەسوتێنێ هەتا لەقرتێنەی (نفض) دەفەی شانیەوە دەئەچێت، وەلەسەر قرتێنەی دەفەی شانی دائەنرێتو وای ئەسوتێنێو دائەچێ هەتا لەگۆی مەمکیەوە دەردەچێت. ئیتر کابرا هەڵدەچۆقێو لەپەلوپۆ دەکەوێت، دوای ئەو قسەیە پیاوەکە ڕۆیشتو لەبن کۆڵەکەیەکدا — ئەستون — دانیشت، منیش دوای کەوتم دانیشتم، نەشم دەزانی کە کێ یەو نەم دەناسی، ئینجا پێم وت : وابزانم ئەو خەڵکە وتەکەتیان پێ ناخۆش بوو : ووتی : ئەوانە هیچ تێ ناگەن، کاکە من خۆشەویستەکەم جارێکیان پێی ووتم: خۆشەویستەکەت کێ یە، ووتی: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : ئەرێ ئەبوزەر تۆ کێوی ئوحد ئەبینی ؟ پیاوەکە ووتی : منیش تەماشای خۆرم کرد هیچی وا رۆژی نەمابوو، وام زانی کە پێغەمبەر (ﷺ)بۆ ئیشێکم ئەنێرێت، وتم : بەڵێ قوربان فەرموو، حەزرەت

(ﷺ) فەرمووی : مـن حـەز ناكـەم ئەوەنـدەی چـیای ئوحـود زێـڕم هـەبێت و هەمووشی بكەم بەخێر، بێجگە لـە سـێ دینـار (واتـە حـەز لـە كەڵەكـەی سـامان ناكەم، مەبەستی ئەمەیە : مـن ئـەوەم پێخۆشـە ئەگـەر بەقـەد چیای ئوحد زێـڕم هەبێت هەمووی لەڕێی خوا خەرج بكەم، بێجگە لەسێ دینار بۆ خـۆم) .بۆیـە مـن دەڵـێم : ئەوانـە تـێ ناگـەن، چونكە هـەر خـەریكن سـامانی دونیـا كۆدەكەنـەوە، نەبەخوا، من دونیـام لێیـان ناوێـت وە لـەبارەی ئاینیشـەوە داوای روون كردنـەوەی هیچیان لێ ناكەم هەتا ئەمرم و ئەچمەوە دیوانی خوای گەورە [٨] .

ئەم فەرمودەیە بوخاری موسلیم گێڕاویانەتەوە .

**وفي روايـة لمسلم: أنـه قـال: بـشر الكـانزين بكـى في ظهـورهم يخـرج مـن جنوبهم، وبكى مـن قبـل أقفـائهم (حتـى) يخـرج مـن جبـاههم، قـال : ثـم تنحنى فقعد، قـال : قلت من هذا، قـالوا : هـذا أبـوذر، فقمت اليـه فقلـت : ماشيء سمعتك تقول قبيل ؟ ماقلت ألأشياء قد سمعته من نبيهم (ص) قـال : قلت : ماتقول في هذا العطاء ؟ قـال خذه، فأن فيه اليـوم معونـة، فـأذا كـان ثمنا لدينك فدعه .**

**واتــە:** لەگێڕانەوەیـەكی موسـلیمدا ئـەم فەرموودەیـە بـەم شـێوەیە هـاتووە : موژدەبێت لە سامانداران‌ی زەكات نەدەر بەوەی كە رۆژی زیندوو بوونەوە بە جـۆرێ لە پشتیانەوە داغ ئەكرێن كە لە خوارووی جەسـتەیانەوە دەر ئەچێت، وە لەپـشتی ملیانەوە وەها داغ ئەكرێن كـە لەتەوێڵیانـەوە دەرئەچێت، ئەحنـەف وتـی : دوای ئەوە پیاوەكە رۆیشت و كەلا كەوت و دانیشت، منیش پرسیم ئـەرێ ئـەوە كـێ یـە؟ ووتیان : ئەوە ئەبوو زەڕە، ئەحنەف ووتی : ئیتر چووم بۆلای پێم ووت : ئـەرێ ئـەو شتە چی بوو تۆ كەمێ لەمەو پێش وتت بەو خەڵكە ؟ ووتی : مـن بێجگـە لـەوەی

[٨] تێبینی / بۆ زانە كردن و وەرگێڕانی ئەم فەرموودەیە سود لە (فتح الباري ج ١١ ص ٢٧١) وەرگیراوە .

که لەپێغەمبەر(ﷺ) بیستووە هیچم نەوتوە. ئەحنەف ئەڵێ : پێم وت : باشە تۆ ڕات چیە لە بارەی ئەو خەڵاتەوە کەئەی بەخشن بەخەڵك ؟ ووتی : وەری بگرە، ئەوە ئەمڕۆ یارمەتیەکە، بەڵام ئەگەر بوو بە نرخی کڕینی ئایینەکەت ئەوسا وەری مەگرەو نەتەوێ .

## چەند فەرمودەیەك لەبارەی خشڵەوە:

**عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: دخل رسول الله صلى الله عليه وسلم فرأى في يدي فتخات من ورق فقال: (ما هذا يا عائشة ؟( فقلت: صنعتهن أتزين لك. قال) : أتؤدين زكاتهن ؟( قلت : لا، أو ما شاء الله، قال : (هي حسبك من النار) . رواه أبو داود والدارقطني، وفي إسنادهما يحيى بن أيوب الغافقي، وقد احتج به الشيخان وغيرهما ، ولا اعتبار بما ذكره الدارقطني من أن محمد بن عطاء مجهول، فإنه محمد بن عمر بن عطاء، نسب إلى جده، وهو ثقة ثبت، روى له أصحاب السنن، واحتج به الشيخان في صحيحهما**

واتە: لەدایکی بڕواداران عائیشە خێزانی پێغەمبەردوە (ﷺ)ووتی : جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ)هاتە ماڵەکەم کەوەختێ دی چەند بازنەیەکی زیوم لە دەستایە فەرمووی عائیشە ئەوە چی یە؟ ووتم: قوربان دروستم کردوون لەبەر خاتری تۆ خۆمی پێ ئارایشت ئەدەم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی ئایا زەکاتیان ئەدەیت، وتم نەخێر، فەرمووی: تۆ ئەوەندەت لە سزای ئاگر بەسە، ئەم فەرموودەیە ئەبوو داود دارە قوتنی گێڕاویانەتەوە، یحیی ی کوڕی ئەیوبی غافقی لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیاندا، کە شێخان (بوخاریو موسلیم) و کەسانی تریش کردوویانەتە بەڵگەو بڕوا پێ کراوە، وە ئەویش کە دارە قوتنی ئەڵێ : گوایە محمد کوڕی **عطاء**

ناسراو نی یە، ناتەواوە چونکە ئەو محمدی کوڕی شمری کوڕی **عطانە** و لێرەدا بە باپیرەیەوە ناوبراوە، وە پیاوێکی متمانە پێکراوی ئاگادارو فەرموودە ڕەوانە خاوەن سوننەکان لە (أصحاب السنن) لێیان گێڕاوەتەوە، بوخاریو موسلیمیش کردویانەتە بەڵگە لە (صەحیحەیندا).

**وعن أسماء بنت يزيد رضي الله عنه قلت : دخلت أنا وخالتي على النبي ﷺ وعلينا أسورة من ذهب، فقال لنا : اتعطيان زكاته؟ قالت: فقلنا لا. فقال: أما تخافان أن يسوركما الله أسورة من نار، أديا زكاته**. رواه أحمد باسناد حسن.

واتە: لەئەسمائی کچی یەزیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: جارێکیان لەگەڵ پورم چوینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ چەند بازنێکی زێڕمان لە دەستابوو، حەزرەت درودی خوای لەسەر بێت فەرمووی: ئەرێ ئێوە زەکاتەکەی ئەدەدن؟ ئەسما وتی: وتمان نەخێر، فەرمووی: ئەی ناترسن خوای گەورە چەند بازنێکی ئاگرتان بکاتە دەست لە ڕۆژی قیامەتدا. زەکاتەکەی بدەن.

ئەم فەرموودەیە ئیمام احمد بە ڕشتەیەکی جوان گێڕاویەتیەوە.

## ماناى زەكات

زەكات لەزمانى عەرەبيدا، بەماناى گەشەو پاك كردنەوەو زۆربوونە، ئەمانەيش هەموويان لە زاراوەو ماناكەيدا مەبەستەو رەچاو دەكرێ، چونكە زاراوەى زەكات بريتييە لە مافێكى پێويست لەسەر هەموو سامانێ بەپێى چەند مەرجو بنەمايەك (ضوابط) ئيمام (أبو الحسن الواحدي) دەفەرموێت: زەكات پاك سازىو چاك سازى ماڵو سامانەو گەشەدەرو پاكو خاوێن كەردوەيشە، رونتريش ئەوەيە كە لە بنەڕەتدا لە زۆربوونەوە هاتبێت، وەهەروەها بۆتە زاراوەى شەرعيش، ئيمامى نەوەوى ئەفەرموێت: وەك خاوەنى كتێبى (الحاوى)و كەسانى تريش دەڵێن: زەكات لە شەرعدا ناوە بۆ وەرگرتنى شتێكى تايبەت لە ماڵێكى تايبەت بە رێوشوێنێكى تايبەت، ئەدرێت بەچەند دەستەو تاقمێكى تايبەت. (بڕوانە - فقه الزكاة ى دكتۆر يوسف قەرزاوى).

**(وآتوا الزكاة) حيكمەتى زەكات چيە؟** .

مسولمانان زەكات دەدەن بۆ ئەوەى لەم رێگەيەوە لە خواى گەورە نزيك ببنەوە و رەزامەندى ئەو بەدەست بهێنن و شايەنى چونە بەهەشت و بەدەست هێنانى نيعمەتەكانى بن و لە سزاكانى دوا رۆژيش بەدوربن، مسولمانان لەبەرامبەردا ئەو ئايەتەىخواى گەورە دەڵێنەوە كە دەفەرموێت: { **وقالوا سمعنا واطعنا غفرانك ربنا واليك المصير**} (٢٨٥) **سورة البقرة** ، زەكات دان سوپاسگوزارى ئەو سامانەيە كەخواى گەورە پێى بەخشيون، لەگەڵ ئەمەشدا لە زەكاتدانندا حيكمەتێكى گەورە هەيە وەك خواى گەورە لەم ئايەتەدا باسى دەكات ، ( **خذ من اموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها** . )

ئيمامى (كاسانى) لەم بارەيەوە دەڵێت :حيكمەت لە دانانى زەكات دەگەرێتەوە بۆ:

**یەکەم:** دانی زەکـات یەکێکـە لـەبوارەکانی هاوکـاری کەسـانی لاوازو هـەژارو بـێ نەوایان و بەهێز کردنیانە بۆ ئەوەی بتوانن بدباشـی ئەرکـەکانیان بەرامبـەر بـەخوا بەجێ بهێنن لەیەکتاپەرستی و عیبادات و ئەو هۆکارانـەی کەفـەرزەکانی بەباشـی بەجێ دەهێنن.

**دووەم:** زەکـات دان هۆیەکـە بـۆ پاککردنـەوەی دەروون لەپیـسیەکان و تـاوان و خۆرازاندنەوە بـە ئـەخلاقی بـەرزو جـوان و بەخـشندەیی و وازهێنـان لـە رەزیلـی و چروکی و خۆشەویستی سامان .

بەشیودیەکی سروشتی مرۆڤ مالّی لاخۆشەویستەو پابەندە پێوەی، بەڵام زەکات رای دەهێنێـت لەسـەر سـنگ فراوانـی و بەخـشندەیی ، هـەروەها فێـری ئـەوە دەبێـت ئەمانـەت بگەرێنێتـەوە و مافـەکانی خـەڵك بداتـەوە بەخاوەنـەکانیان، ئەمـەش هەمووی لەم ئایەتەدا هەیە کە دەفەرموێت ( **خُـذ مِـنْ امْـوالِهِمْ صـدَقَة تُطهـرُهُمْ وتُزَكيهِم بِهَا** . )

**سێیەم:** خوای گەورە رێزی لە دەوڵەمەنـدەکان نـاوە بـەوەی کـە مـاڵ و سـامانێکی پێداون کە لە پێویستی خۆیان زیاترە، بەم هۆیەشـەوە بـە ژیـانێکی خـۆش دەژیـن، لەبەر ئەوە سوپاس گوزاری ئەم دەوڵەمەندانە بۆ خوای گەورە فەرزە لە روی عـەقڵ و شەرعەوە .

پێدانی زەکات بەهەژاران لەبابی سوپاسگوزاریە و فەرزێکەو دەبێت ئەنجام بـدرێت، زەکات هۆکارێکە بۆ پاك کردنەوەی خاوەنەکەی لەرەزیلی و چروکی و بەخیلی و رق و کینە و خۆپەرستی و پاککردنـەوەی ماڵـە، لـە لایـەکی تریـشەوە هۆکارێکـە بـۆ گەشەو زۆربوونی سامان، لەم بارەیەوە خـوای گـەورە لـە وەسـفی سـەدەقە و خێـرو خێراتدا دەفەرموێت (**يَمْحَقُ اللّهُ الربَا ويُرْبِي الصدَقَاتِ** )

لەهەمانکاتدا زەکات هۆکارێکە بۆ پاك کردنەوەی دەروونی هەژارانیش.لەم ڕێگەیەوە بەشێك لەجیاوازی چینایەتی چارەسەر دەبێت و ڕق و قین لەدەروونیاندا ناهێڵێت و دەبێتە مایەی گەشەکردنی خۆشەویستی و هێمنی و نارامی.

لێرەوە دەتوانین بڵێین زەکات پاککردنەوەی کۆمەڵگایە بەهەردوولایەنی هەژارو دەوڵەمەندەوە لەنەخۆشیە دەرونیەکانی وەك ڕق، چارەسەرە بۆ نەخۆشیەکانی دڵ و هۆکاری هێنانی خۆشەویستی و یەکڕیزی و تەبایی و سۆزە، لە هەمانکاتدا بەرجەستەکردنی برایەتی ئیسلامی و مافەکانیەتی. ئەمەش بۆ ئەوەیە کەمسوڵمانان وەك جەستەیەك دەربکەون، ئەگەر ئەندامێکیان هەست بە ئازار بکات ئەوا هەموو ئەندامەکانی تر هەستی پێ دەکەن، لەلایەکی تریشەوە زەکات مافێکی داراییە کەپێویستە لەسەر دەوڵەمەندەکان ئەنجامی بدەن بۆ ئەوەی تەکافولی کۆمەڵایەتی و هاوکاریەکی برایانە لە کۆمەڵگەدا بەرجەستە ببێت .

**( وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ) ( وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ )**

هەروەها زەکات چارەسەرێکە بۆ هەژاری، کەئیسلام هەر لەسەرەتاوە دژایەتی کردوەو پێغەمبەری خواش پەنای گرتووە کەتوشی نەبێت.

کەواتە زەکات فەرزو پێویستە. (بڕوانە: بدائع الصنائع ٢/٨١١).

## پایەکانی زەکات

واتە: ئەو پایەو بناغانەی دەبنە هۆی پێویستی زدکاتدان، هەرکات یەکێکیان نەبوو زەکات پێویست نابێت، پایەکانی زەکات سیانن:

١- زەکات دەر، خاوەن ماڵ.

٢- ئەو ماڵەی گەیشتبێتە رادەی زەکات.

٣- ئەو کەسانە، یان ئەو لایەنانەی زەکاتیان پێ ئەشێت.

وە ئەمانەیش هەریەکەیان چەند مەرجو بنەمای (ضوابط)ی خۆی هەیە، کە ئێمە باسیان دەکەین لەگەڵ باسکردنی هەر یەکێکیاندا.



## زەکاتدەر ( خاوەن ماڵ )و مەرجەکانی

زەکاتدەر ئەو کەسەیە کە زەکاتی لەسەر پێویستە، زەکات لەسەر ئەو موسڵمانە پێویستە کە ماڵەکەی بگاتە رادەی دیاری کراوی پێویست (النصاب) بۆیە لەم روانگەیەوە زەکات لەسەر کافر پێویست نییە هەرچەند (ذمي)ی بێتو لە وڵاتی ئیسلامو موسڵماناندا بژی، بەڵام شەرع رێ لەوە ناگرێ کە سەراندو ماڵانەی گونجاو بسەنرێت لەو (ذمییانە)ی کە لە وڵاتی موسڵماناندا ئەژین، هەتا هاوبەشی بکەن لە ئەرکی دابینکردنی ئاساییشو دامەزراوی وڵاتەکەدا، ئیتر بابەهەر ناوێکیانەوە بێت. زەکات لە ماڵی منداڵو شێتیش پێویستەو دەبێ سەرپەرشتیارەکەیان ئەو زەکاتە بدات، هەروەك دەبێ ماڵەکەشیان بخاتە ئیشەوەو بازرگانی پێوە بکات، ئەمیش چونکە ئەو دەقە شەرعییانەی لەبارەی زەکاتەوە هەیە بۆ هەموو ماڵو سامانی موسڵمانەکانە بەگشتی، سەرەڕای هاتنی هەندێ فەرموودە کە بە

راشکاوی دەبێتە بەڵگە، وەك ئەوەی کە (طبرانی) لە کتێبی (الأوسط)دا لە ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتییەوە، ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إتجروا في أموال اليتامى لاتأكلها الزكاة). واتە : ئێوە بازرگانی بە ماڵی هەتیوانەوە بکەن، نەکا بەهۆی زەکاتەوە هیچی نەمێنێت.

هەیسەمی دەڵێ: مامۆستای گەورەو پایە بەرزم پێی وتم : ڕشتەی ئەم فەرموودەیە ساغو تەواوە. مامۆستاکەی (الحافظ زين الذين العراقي)یە (مجمع الزواند ٢/٦٧).

## پایەی دووەم

## ماڵو سامانە زەکات لێدراوەکە

لێرەدا مەبەست لە ماڵ هەموو شتێکە کە نرخو سودی هەبێتو بشێ کە خاوەنەکەی دەستی بگاتێو بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. زاناکانی (فقە) هەموو یەك ڕان لەسەرئەوەی کە زەکات پێویستە لە زۆربەی ئەو ماڵو سامانەی لە کاتو سەردەمی خۆیاندا هەبوو، وەك حوشترو ڕەشەوڵاخو مەڕو بزنو زێڕو زیو (کرابن بە نەقدو دراو یان هەر پارچەو داڕێژراو بن) وە لە هەندێ جۆری بەروبوومی کشتوکاڵی وەك : (گەنم و جۆ و خورما و مێوژ)، وە لە سامانی بازرگانیدا. بەڵام ڕایان جیاوازە لە هەندێ جۆری ترا، وەك هەنگوینو بەرزە ولاخێ کە بۆ (غەزا) ئامادە نەکرابێ وە وێنەی ئەمانە. ئەوەی کە بە ڕوونی دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتو ژێری پشتگیری دەکەنو لایان پەسەندە ئەوەیە کە زەکات پێویستە لە هەموو ئەو ماڵو سامانەی کە بگاتە پلەو ڕاددەی پێویستو هەموو ئەو مەرجو کۆگرانەی کە شەرع بۆی داناوە تیایدا کۆبێتەوە. لەو دەقانە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**﴾التوبة/١٠٣. هەروەها ئەفەرموێت:

**{وَالَّـذِينَ فِـي أَمْـوَالِهِمْ حَـقٌّ مَّعْلُـومٌ * لِّلـسَّائِلِ وَالْمَحْـرُومِ }المعـارج/٢٤** . وه ئەفەرموێت: **{وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ }الذاريات/١٩** . ماناى ئەم ئايەتانەمان لە پێشەوە روونكردۆتەوە. ئەوەتا وشەى (**الأموال**) رەهايەو نەبەستراوە بە جۆرى مـاڵ يـا جـۆرێكى تـرو هـيچ تايبـەت نـەكراوە، وە ئەمـەيش دياردەيـە لەسـەرئەوەى كـە ئـەم مافـە ئاشـكرايە (زەكـات)ە لـە هـەموو ماڵێكـدا هەيـەو چەسپاوە. هەروەها سوننەتى پيرۆزيش بەڵگەيە لەسەر پێويستى زەكـات لـە مـاڵى دەوڵەمەنـدەكانو وەرگـرتنو دابەشـكردنى بەسـەر هەژارەكانـدا — وەك لەپێـشەوە باسمان كرد.

ژيريش ئەوە پەسەند ئەكات كە جياوازى نەكرێت لە نێوان ئەم يا ئەو ماڵـدا، هـەر كات پلەو رادەى زەكاتيان هەبێت، چونكە هەركات ئامانج بێتـەدىو نـرخو سـودى ماڵ ديار بێ ئيتر جياوازى لەبەر چى؟ خـۆ ياسـاو رێـساكانى (**قواعـد**) شـەرعيش يـەك بريـار داوا ئـەكات بـۆ هـەموو شـتە هـاو رووەكـانى وەك يـەكو دەشـيەوێت يەكسانى بكرێت لە نێوان كەسێكى خاوەن جۆرى ماڵى پلە زەكاتو كەسێكى ترى خاوەن جۆرێكى ترى ماڵى پلە زەكاتدا، لەلايەكى تريـشەوە عـورفو نـەريت رۆڵـى خۆى هەيە لەم بوارەدا، واتە ئەشێت هەندێ شمەك لە چەرخو سەردەمێكدا خـاوەنى نـرخو بەهايـەك بێـت، بـەڵام ئـەو نرخـەى نـەمێنێت لـەكاتێكى تـردا. خـۆ مـاڵو سامانيش بەنرخو سود بايەخى دەبێت، وەزۆر شتى وا هەيە كـە لەمەوبـەر نـەبووە يان ئەگەر بووبێتيش وەك پێويـست كـەڵكى لێ نـەبينراوە. وە بـەهۆى دەمـاو دەم كەوتنەوە زانراوە كەشەريعەتى ئيسلام لەسەر دادگـەرىو يەكـسانى كـردن هاتۆتـە گۆڕێو پەيدا بووە خۆ روونو ئاشكرايە كە دادگـەريى يەكـسانى لـە نێـوان خـاوەن سامانەكاندا بڕيار ئەدا لەو كاتەدا كە يەكسانى لـە نـرخو بـەهاى مـاڵو سـاماندا هەبێت، وەبەم وتەو بۆچوونە هەندێ لە زانايان كاريان كردووەو بڕياريان داوە، وەك:

عومەری کوڕی عەبدالعزیزو مجاهیدو حمادو ئیمام ئەبوو حەنیفەو داودو نەخەعی (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەتایبەتی لەبارەی بەرهەمی زەوی‌و کشتوکاڵەوە. وە ئێمە بەیارمەتی خوای گەورە لەسەر ئەم بڕیارو ڕێبازە باسی چۆنیەتی زەکاتی بەم جۆرە سامانانە دەکەین، وەك: سامانی ئاژەڵ، هەنگوین، بەرهەمەکانی ئاژەڵ، بەروبوومی کشتوکاڵ، کانزا، گەنجینە، زێڕو زیو، خشڵ، قاپ‌و قاچاغی عەنتیکەی لەزێڕو زیو دروستکراو، ئەو شتەی لەدەریا دەربهێنرێت، ماڵی بازرگانی، دەستکەوتەکانی کارگەو کۆشکە گەورەکان، موچەو کرێ، بەخشیش، بەش‌و سەنەدو کۆمپیالە وە لەبەشێکی سەربەخۆشدا زەکاتی (قەرز) هەتبێت یان لەسەرت بێت.

وە گواستنەوەی زەکات‌و نرخ‌و قیمەتی کە لەجیاتی زەکات‌و سەرفیترە ئەدرێت باس ئەکەین، هەروەها باسی زەکاتی ماڵی حەرام‌و بە وەقف کراوو سامان‌و ماڵی دەوڵەت ئەکەین، لەسەرەتاشەوە مەرجە گشتیەکانی ئەو ماڵ‌و سامانەی زەکاتی لێ ئەدرێت دەس پێ دەکەین.

## مەرجە گشتییەکانی ئەو ماڵەی زەکاتی لێ ئەدرێت :

**١- کاتێ زەکاتی ماڵ‌و سامان پێویست ئەبێ کە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدابێت:**

١- دەبێ ماڵەکە بە تەواوی ماڵی کەسی زەکاتدەر بێت، واتە دەبێ خاوەنی شتەکە خۆی‌و سودەکانیشی بێت، یان وەك زاناکان (**فقهاء**) ئەڵێن: (**ملكية الرقبة والمنفعة**) خاوەنێتی شتەکە خۆی‌و سودەکانی بە تەواوی بۆ زەکات دەربێت، لەبەرئەوەیە کە سێ ماڵی خوازراو بەکاربێنێت، یان کرێ گرتەی خانووبەرەو زەوی‌و زار بێت، لەسەری نییە زەکاتەکەیان بدات. بەڵکو لەسەر خاوەنەکەیان پێویستە، هەروەها زەکات لە ماڵی حەرام‌و وەقف کراویشدا واجب نییە، وە زەکات لەماڵی

**(الضمار)** واته ئەوەی خاوەنەکەی نەتوانێ کەڵکی لێ وەربگرێت پێویست نییە، وەك ئەو ماڵەی داگیرکرابێتو خاوەنەکەی بۆی نەسەنرێتەوە.

٢- دەبێ ماڵەکە بگاتە (نصاب) واتە لا ی خوارووی رادەی پێویستی زەکات، چونکە ئایینی ئیسلامی پیرۆز چاوپۆشی لە هەندێ ئەندازەی هەموو ماڵێك کردووەو زەکاتی تیا پێویست نەکردووە، ئینجا چونکە رادە (نصاب)ی زەکاتی مەڕو بزن چل سەرەو هی رەشە ولاّخ سی سەرەو هی حوشتر پێنج سەرە. وە رادەی زەکاتی زێر بیست مسقاڵە، وە هەروەها.. ، وەك لەمەودا ئەمانە باسو راڤە دەکەین، لەم روانگەیەوە زەکات لە ماڵی کەمتر لە نیصابدا نییە.

٣- دەبێ ماڵەکە شیاوی گەشەو زۆربوون بێت، وەك ئاژەڵو ماڵی بازرگانیو شتی تریش، یان لەتوانایدا کە گەشەو نەشە بکات، وەك دراو، کە تێبینی زۆربوونی لێ دەکرێت با نەشخرابێتە کڕینو فرۆشتنەوە، چونکە لەخۆیدا ئەکرێت خاوەنەکەی یان کەسێکی تر بازرگانی پێوە بکاتو زۆر بێت. ئینجا ئەگەر بەکارنەهێنرا بەهۆی کەمتەرخەمی خاوەنەکەیەوە دەبێ هەر هۆی ئاکامەکەی هەڵگرێت، بۆ نموونە ئەگەر کەسێ چل هەزار ریاڵی لەقاسەی ماڵەوەیدا هەبێت، یان لای کەسێکی تر دایبنابێت، ئیتر بەمەبەستی بەکارهێنانی ئەو کەسە بۆخۆی یان بۆ ژن پێ هێنان، یان خوێندنو وێنەی ئەمانە، ئەوە پێویستە خاوەن پارەکە لە ٢,٥٪ زەکاتی لێ بدت هەرکات ساڵی بەسەرا هاتەوە.

کاسانی لەم بارەیەوە دەڵێت: **"مەبەستمان لەگەشەو نەشەی ماڵ ئەوە نییە کەلەباری راستەقینەی گەشەکردندا بێت، چونکە ئەوە پێویست نییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەو ماڵە ئامادەی گەشەو زۆربوون بێت، بەهۆی بازرگانییەوە، یان بەهۆی لەوەڕاندنەوە، چونکە لەوەڕاندنی ئاژەڵ دەبێتە هۆی پەیدابوونی بەروبوومی وەك زاوزێو شیرو رۆن، وە بازرگانیش دەبێتە هۆی قازانج کردن،**

**کەواتە هۆکاری شت لەشوێنی شتەکەدا دائەنرێتو بڕیاری تیا بەرجەستە ئەکرێت، وەك ڕێبواری (السفر) لەگەڵ ناخۆشیو ماندووبوونا (المشقە)"** (بدانع الصنائع ٨٢٨/٢).

٤- <u>دەبێ ئەو ماڵە لە پێویستیە بنەڕەتیە سەرەکییەکانی خاوەن ماڵ زیاتر بێت،</u> چونکە بەوە دەوڵەمەندیو مانای نازونیعمەت پەیدا ئەبێتو بەدڵ پاکیو خۆشحاڵیەوە زەکات ئەدرێت، چونکە ئەگەر کەسێ هەر ئەوەندەی ماڵ هەبێت کە پێویستیە سەرەکیو بنەڕەتیەکانی ژیانی خۆیو منداڵەکانی دەربێنێت ئەوە دەوڵەمەندو خاوەنی نازونیعمەت نییە، چونکە ئەوەی کە هەیەتی هەریەشی پێویستی مانو زیندەگیو لەش ساغی ئەکات، بۆیە وەك نیعمەتی لەش ساغی سوپاسی خوای گەورەی لەسەر ئەکرێت، وە بە دڵێکی پاكو خۆشەوە زەکاتی لێ نادرێت، وەلەبەرئەوەی راستەقینەی پێویستی بنەڕەتیو سەرەکی بۆ ژیان شتێکی نادیارو شاراوەیە بۆیە بەڵگەی زیاتری لە پێویست لە شوێنەکەیدا دانراوە، کە ئەویش بریتییە لە ئامادەکردنی ئاژەڵ بۆ لەوەڕو بازرگانی کردن بە شمەك، ئەمەش فەرمایشی زۆربەی زاناکانە، بەڵام پێشەوا مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت : ئەم زیاتر بوونە مەرجی پێویست بوونی زەکات نییە. (بڕوانە بدائع الصنائع ٢٢٨/٢، ٢٩٩)و (فقە الزکاة ١٦٢/١). ئینجا سەبارەت بەوەی کە زەکات پێویست نییە لە خانوی نیشتەجێو ولاخی سواری، یان بەگوێرەی سەردەمی ئێمە ئوتومبیلی سواریو بەرگ پۆشینو چەکی بەرگری لەخۆکردنو لە کتێبی زانستو ئامێرەکانی پیشەو کارپێکردنو وێنەی ئەمانە. بەڵام دەبێ زەکات بدرێ لەو دراوەی کە خاوەنەکەی پێویستی خۆی پێیەتی کەچی خەرجی ناکات هەتا ساڵی بەسەرا دێتەوە چونکە بایەخ بە هەبوونەکەیە.

٥- بەسەراهاتنەوەی ساڵ، زانایان هەموو یەك راو تەبان لەم مەرجەدا بۆ سامانی ئاژەڵو بازرگانیو دراوو شتی تری وەك ئەمانە، وە یەك ران لەوەشدا کە لەبەرهەمە کشتوکاڵییەکاندا بەسەراهاتنەوەی ساڵ مەرج نییە، بەڵام راو بۆچوونیان جیاوازە لە دەستکەوتی مووچەو کرێدا (المال المستفاد) وەك لەمەودوا باسی دێت.

## زەکاتی سامانی ئاژەڵ

زانایانی شەرع (الفقهاء) کۆڕاو تەبان لەسەر پێویستی زەکات لە حوشترو رەشە وڵاخو مەڕوبزن (الأنعام) بەڵام لەگیانلەبەرانی تری بێجگە لەمانە راو بۆچوونیان جیاوازە، وەمەرجەکانی پێویست بوونی زەکاتی ئاژەڵ ئەوەیە کە دەبێ ساڵی بەسەرا بێتەوەو لەوەڕ خۆری دەشت بێت، واتە دەبێت زۆربەی ماوەی ساڵ بەلەوەڕی لەدەشتدا بژیو بەسی بێت، بەڵام ئەگەر زۆرینەی ماوەی ساڵ پێویستی بە ئالفی ماڵەوە بوو ئەوە زەکاتی تیا پێویست نییە، ئەمەو هەندێ لە زانایانی شەرع (الفقهاء) کە ئیمامی مالیك (رەزای خوای لێ بێت) یەکێکە لەوان، دەڵێن: ئاژەڵ هەر چۆن بژی پێویستە زەکاتی لێ بدرێت، واتە مەرج نییە کە بەلەوەڕی دەشت بژی.

هەروەها مەرجە کە نابێ ئاژەڵ بەکاربێت لە کێڵانو ئاوکێشانو بارکێشاندا. واتە: ئاژەڵی کارگوزار زەکاتی لێ نادرێت بەلای جەماوەری زانایانی شەرعەوە، بەڵام ئیمامی مالیك ئەم مەرجەی رەچاو نەکردووەو بەلایەوە زەکاتی ئاژەڵ با کارگوزاریش بێت هەر پێویستە بدرێت لە (القوانين الفقهية) دا ١٠٧ هاتووە: زەکات لە ئاژەڵدا پێویستە هەرچۆن بژی، با کارگوزاریش بێت، ئەمەیش

پێچەوانەی رای جەماوەری زانایانی شەرعە، بڕوانە (**المغني لإبن قدامة ٥٧٧/٢ و الروضة ١٩٠/٢ و بداية المجتهد ٢٥٢/١ وفتح القدير ١٧١/٢**).

### ١. زەکاتی رەشە وڵاخ:

زەکات لە رەشەوڵاخدا بە سوننەتو ئیجماع پێویست کراوە، هەرکات گەیشتە (نیصاب) واتە: کە ژمارەیان بگاتە سی سەر، دەبێ یەکساڵەیەکی نێر (تبیع)ێ بدرێت بە زەکات، وە کە گەیشتە چل سەر دوو ساڵەیەکی مێ (مسنة) ئەدرێت. پاشتر لە شەست سەر دوو یەك ساڵەی نێر (تبیعان)و لە حەفتا سەر دوو ساڵەیەکی مێو یەکساڵەیەکی نێر (مسنة وتبیع)و لە هەشتا سەر دوو ساڵەی مێ (مسنتان) زەکاتیان لێ ئەدرێت. ئیتر بەو شێوەیە، لە هەموو سی سەرێ یەکساڵەیەکی نێر (تبیع)و لە هەموو چل سەرێك دوو ساڵەیەکی مێ (مسنة) ئەدرێ.

## ٢. زەکاتی حوشتر :

موسڵمانان هەموویانو فەرموودە راستو دروستەکانی کەلە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوونو لە هەردوو هاوڕێی بەڕێز (ئەبوبەکرو عومەر)ەوە گەیشتوون (رەزای خوایان لێ بێت) هەموو یەکن لەسەر ئەوەی کە رادەو (نیصاب) چەنیەتی (مقدار) زەکاتی حوشتر لە پێنج سەرەوە هەتا ئەگاتە (١٢٠) سەدو بیست سەر بەپێی ئەم نەخشەیەی خوارەوە ئەبێت:

| رادەی نیصاب<br>زەکاتەکەی (القدر الواجب فیە) | | |
|---|---|---|
| لە | بۆ | تێبینی |
| ٥ | ٩ | یەك سەر مەڕ یان بزن = کاوڕێکی یەك ساڵ یا چتیرێکی دوو ساڵ |
| ١٠ | ١٤ | دوو سەر |
| ١٥ | ١٩ | سێ سەر |
| ٢٠ | ٢٤ | چوار سەر |
| ٢٥ | ٣٥ | حوشترێکی یەك ساڵەی مێ (بنت مخاض) |
| ٣٦ | ٤٥ | حوشترێکی پێ لەسێ ساڵی مێ (بنت لبون) |
| ٤٦ | ٦٠ | حوشترێکی پێ لەچوار ساڵی مێ (حقة) بەرکەڵ. |
| ٦١ | ٧٠ | حوشترێکی پێ لە پێنج ساڵی مێ (جذعة) |
| ٧٦ | ٩٠ | دوو حوشتری پێ لە سێ ساڵی مێ (بنتا لبون) |
| ٩١ | ١٢٠ | دوو حوشتری پێ لە چوار ساڵی مێ (حقتان) |

**بەڵام زاناکان رایان جیاوازە لەزەکاتی حوشترگەلی دوای (١٢٠) سەدو بیست سەرو، زۆربەیان رایان وەك ئەم نەخشەی خواردودیە:**

| لە | بۆ | زەکاتەکە (القدر الواجب فیه) |
|---|---|---|
| ١٢١ | ١٢٩ | سێ حوشتری پێ لەسێ ساڵی مێ (بنتا لبون) |
| ١٣٠ | ١٣٩ | یەك حوشتری پێ لەچوار ساڵی مێ لەگەڵ دوانی پێ لەسێ ساڵی مێ |
| ١٤٠ | ١٤٩ | دوو حوشتری پێ لەچوار ساڵی مێ لەگەڵ یەکێکی پێ لە سێ ساڵی مێ |
| ١٥٠ | ١٥٩ | سێ حوشتری پێ لەچوار ساڵی مێ |
| ١٦٠ | ١٦٩ | چوار حوشتری پێ لەسێ ساڵی مێ |
| ١٧٠ | ١٧٩ | سێ حوشتری پێ لە سێ ساڵی مێو یەکێکی پێ لەچوار ساڵی مێ |
| ١٨٠ | ١٨٩ | دوو حوشتری پێ لە سێ ساڵی مێو یەکێکی پێ لەچوار ساڵی مێ |
| ١٩٠ | ١٩٩ | سێ حوشتری پێ لەچوار ساڵی مێ لەگەڵ یەکێکی پێ لە سێ ساڵی مێ |
| ٢٠٠ | ٢٠٩ | چوار حوشتری پێ لەچوار ساڵی مێ، یان پێنج حوشتری پێ لە سێ ساڵی مێ. |

### ٣. زەكاتی مەڕو بزن :

قورئانی پیرۆز بەشێوەیەكی هەمەگیر (عموم الكتاب)و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەشێوەی تایبەتو ئیجماعی زانایان زەكاتی گۆتاڵیان چەسپاندووەو پێویستیان كردوە. وە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان فەقیهەكاندا (الفقهاء) كە رادەی (نصاب)ی زەكاتی گۆتاڵ (مەڕوبزن) چل سەرەوە دەبێ مەڕێك یان بزنێك بدرێ بەزەكات هەتا ژمارەیان ئەگاتە (١٢٠) سەدو بیست سەر، وە لە (١٢١) سەدو بیست و یەك سەر هەتا (٢٠٠) دووسەد سەر ئەدرێت، پاشتر لە دووسەدو بیستو یەك سەر هەتا ئەگاتە سێ سەدو نەوەدونۆ سەر دەبێ سێ سەر زەكات بدرێت، دواتر لە هەموو سەد سەرێك دەبێ یەك سەر بدرێت بەزەكات.

بێچووی ئاژەڵ (حوشترو رەشەولاخو مەڕو بزن) واتە (الفصلان، العجاجیل، الحملان) ئەمانە ئەخرێنە پاڵ دایكیان لە كۆتایی ساڵدا، ئەگەر ئەو دایكانەیان زەكاتیان لێ بكەوێت، واتە بەسەراهاتنەوەی ساڵیان تیا پێویست نییە. ئەمەش سەنگینترین فەرمایشی زاناكانی شەرعە، ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافعی (رەزای خوایان لێ بێت) رایان وایە..

### ئەوەی پێویستە رەچاو بكرێت لە زەكاتی ئاژەڵدا :

١- دەبێ حەیوانی زەكات عەیبی نەبێت، واتە: نابێ نەخۆش یان پیر بێت، بەڵكو دەبێ حەیوانێكی مام ناوەندی بێت.

٢- حەیوانی زەكاتیو حوشتر دەبێ مێینە بێت، بێجگە لەوەی فەرمووده پەسەندی كردووە كە ئەشێ دوو ساڵەی نێر لە جیاتی یەك ساڵەی مێ بدرێت، چونكە جیاوازی ساڵ لە جیاتی مێنگینە دائەنرێت، بەڵام رەشەولاخو گۆتاڵ ئەوە ئەشێ نێرینەیان لێ بدرێت بەزەكات بەڕای سەنگینی زانایان.

٣- دەبێ ئەو تەمەنو ساڵانەی کە دەقی فەرموودەی پیرۆز دیاری کردوون ڕەچاو بکرێن، وەك یەك ساڵەی مێ (بنت المخاض).

## کاریگەریی تێکەڵی لەزەکاتی ئاژەڵدا:

هەرکات زیاتر لە کەسێ بەجۆرێ ئاژەڵیان تێکەل کرد، کەیەك پەچەو یەك لەوەڕگەو یەك ئاودانییان هەبوو، ئەوسا یەك زەکاتیشیان ئەبێت، واتە یەك سەرژمێریان بۆ ئەکرێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت (**لا يجمع بين متفرق، ولا يفرق بين مجتمع خشية الصدقة، وماكان من خليطين فإنهما يتراجعان بينهما بالسوية**) واتە : حەیوانی جیا یەك ناخرێتو حەیوانی تێکەلاویش جیا ناکرێتەوە لە ترسی زەکات لێدان، ئەو زەکاتەش کە لە تێکەلاوەکە ئەدرێت دوای ئەوە هەردوولا وەك یەك لە نێوان خۆیاندا پیادەگەڕێنەوەو نرخەکەی بەش ئەکەن. (ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاریو خەڵکی تریش گێڕاویانەتەوە) بڕوانە بوخاری لەگەڵ (فتح القدير ٣/٢١٥).

## زەکاتی بەرزە ولاخو وێنەکانی:

ئەگەر بەرزە ولاخ بۆ جیهاد و تێکۆشان لەڕێی خوادا یان بۆ سواری یان بۆ بارکێشان ڕاگیرابوو، ئەوە بە ئیجماع زەکاتی لێ نادرێت، وەلێ ئەگەر ماڵی بازرگانی بوو، ئەوە پێویستە زەکاتی لێ بدرێتو هەروەك شمەکی تری بازرگانی نرخی بۆ دائەنرێت، وە هەروەها بەرزە ولاخی ئالیك خۆری زۆرینەی ساڵ زەکاتی تیا نییە ئەگەر ماڵی بازرگانی نەبوو. بەلام رای فەقیهەکان (الفقهاء) لە زەکاتی بەرزەی لەوەڕ خۆری دەشتا، کە بۆ زاوزێ ڕاگیرابێت جیاوازە، وە بەبۆچوونی جەماوەریان زەکاتی لێ ناکەوێت، لەکاتێکدا ئیمام ئەبو حەنیفە وای بۆ دەچێ کە

زەکاتیـان تیـا پێویـستە، بەڵگـە بەهەنـدێ فـەرمووده‌ی راسـتو دروسـت وە بـە ئاسەواری چەسپاوی هاوڕێکانی ئەم رایەش سەنگین ترە.

وە لەبارەی رادەی (نیصـاب) زەکاتو چـەندو چۆنیەتیەوە بـەرزە ولاَخ وەك حوشـتر رەچاو نەکرێت، کەواتە بۆ پێنج بەرزە ولاَخ دەبێ مەڕێك یا بزنێك بدرێ بە زەکات، وە هەروەها.. یان دەبێ وەك کەلوپەلی بازرگانی بینرخێنن، یـان بـۆ هەربەرزەیـەك دەبێ دینارێك بدرێت بەزەکات. واتە: بۆ هەرسەرێك دەبـێ (چـوار غـرامو چـارەکە غرامێك زێـڕ) بـدرێت یـان نرخـی ئەوەنـدە زێـڕ بـەدوای سـەردەمو رۆژ بـدرێت بـە زەکات.

هەروەها لـەبارەی گیانـدارەکانی تـری وەك فیلـیش هـەروەها بەوێنـەی رەشـە ولاَخ بڕیاری تیا نەدرێتو زەکاتی لێ نەدرێت، بـەلاَم گیانلەبـەری جەسـتە بـچوکی وەك ئاسكو شتی تر، ئەوە بۆ زەکاتەکەی بە مەڕو بزن رەچاو ئەکرێت.

## زەکاتی هەنگوینو بەروبوومی گیانلەبەران:

زەکات لە هەنگویندا پێویستە بەلای گرۆی ئیمام ئەبو حەنیفـەو گـرۆی حەنبـەلیو یەکێ لە دوو فەرمایشی ئیمامی شافیعیدا، ئەوەیش لە حەزرەتی عومەرو هەنـدێ هاوڕێو شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕدراوەتـەوە، کاریـان پێکـردووە، وە ئەویش رای قورسو سەنگین ترە. وە رادەی (نیـصـاب)ی هـەنگوین (پێـنج ویـسقە) کە دەکاتە نزیکەی (٦٤٧) شـەش سـەدو چـلو حـەوت کیلـۆ غـرام، ئەوسـا دەبـێ دەیەکی (١٠٪)ی زەکاتی لێبدرێت، دوای لێ داشـکانی پـارەی تیـا خـەرج کـراو، ئەگەر خەرج هەبوو.

وە لە بەروبوومی گیانلەبەرانی وەك: ئاوریشمی (کرمی ئاوریشمو هێلکەو شیر) لێ دروستکراوەکانی ئەوە پێویـستە زەکاتی لێ بدرێت بەرێـژەی ١٠٪، واتـە: دەیـەکی

پوختەی دەسکەوت دوای لێ شکاندنی پارەی تیا خەرج کراو، ئەمەیش لەسەر ئەو یاسا فیقهیە (القاعدة الفقهیة)ی کە بڕیار ئەدا بەوەی هەرشتێ خۆی لەخۆیدا زەکاتی تیانەبێت، ئەوە لە بەروبوومو دەسکەوتەکەیدا زەکات پێویستە، وەك: کشتوکاڵ لەگەڵ زەویدا، وە هەنگوین لەگەڵ هەنگو شیرو لێ دروستکراوەکانی شیری مەڕومالاتی ئالیك خۆر. وە هێلکەی مریشكو ئاوریشمی کرمی ئاوریشم.

## زەکاتی سامانی کشتوکاڵ

لە هەموو بەروبوومێکی زەویدا زەکات پێویستە بەمەرجێ سود بەخش بێو، بگاتە پێنج وەسق، وەسقێ شەست مەنە، مەن واتە: صاع، صاعێ گەنم بە کێشان دەکاتە: ٢,١٥٦ کیلۆ گەنم، بەڵام ئەگەر شتەکە پێوانەی نەبوو، وەك لۆکەو سەوزەواتو تەڕە، ئەوە رای دامەزراو، بەلای دکتۆر یوسف قەرزاویەوە، کە مامۆستای ئێمەیە، لەم کاتەدا ئەوەیە: کە بایەخ بەبەها بدرێ، چونکە ماڵی زەکات لەخۆگرە، بەڵام یاسادانەر (کە خوای گەورەیە) رادە (نیصاب)ەکەی، بەدەق جیاری نەکردووە، لەباری وایشدا بایەخ بە نرخی ئەو شتە دەکرێ کە بە وەسق دەپێورێ، جا لەناو ئەو شتانەیشدا کە پێوانەیان هەیە، کامیان گونجاوتر بێ، بایەخ بەبەهای پێنج وەسق لەو شتە دەکرێ. بەپێی وڵاتیش پسپۆڕان بڕیاری دیاریکردنی چی مەیان تر دەدەن (مەیانەتر : اوسط) بۆ وێنە : ئەگەر نرخی پێنج وەسق گەنم (٥٠٠) پێنج سەد دینار بوو، نرخی پێنج وەسق جۆ(٤٠٠) چوار سەد دینار بوو، نرخی پێنج وەسق برنج (٦٠٠) شەش سەد دینار بوو، بایەخ بەبەهای گەنمە. واتە: ئەگەر جوتیارێ بێستانی شووتی هەبوو، بایی (٥٠٠) پێنج سەد دیناری لێ فرۆشت، یان پتر، ئەوە دەبێ زەکاتی لێ بدا، دەنا نا، وەهەروەها.

لەبارەی ئەندازەی زەکاتی بەروبوومی زەوییەوە، ئیبنو قودامە دەفەرموێ : (بەشێوەیەکی گشتی، هەرشتێ بەراو بێ، ئاودانی ئەرك‌و مەسرەفی هەبێ، بە دۆلاب ئاو بدرێ یا بە جۆگە یا بە دۆڵچە ، یا بە چەرخ یا بەهەرشتێکی تر، کە پارەی تێ بچێ، ئەوە نیوەی دەیەك (نصف العشر) زەکاتی لێ دەکەوێ، واتە: بیست یەك، وەهەرشتێ ئاودانی بەخۆڕاییی بی دەیەکی لێ دەکەوێ، بەپێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە لەم بارەیەوە گێڕامانەوە، وەکو تریش ئەرك‌و خەرجی‌و پارە تێچوون، بەشێوەیەکی گشتی بۆ لەکۆڵ خستنی زەکات کاریگەرن، بەبەڵگەی ئەوە کە زەکات لە ئاژەڵی ئالیك خۆری ناکەوێ، دەی بۆ کەم کردنەوەی ئەندازەی زەکات، هەق وایە کاریگەرتر بن، لەبەرئەوەیش کە زەکات لەماڵێ دەکەوێ، کە نەشو نما بکا، دەی مەسرەف‌و پارە تێچوون کاریگەری هەیە لە لاوازی نەشونمادا، لەبەر ئەوە تیا خەرج کردن کاریگەری هەیە لە کەمکردنەوەی ئەندازەی پێویست لەزەکاتدا (المغني ٦٩٩/٢).

لەمەیشدا بایەخ بەلای زۆرینەی ئەو وەرزەیە، بۆ نموونە : ئەگەر لە دەمانگ، شەش مانگی بەپارە ئاو دەدراو چواری بەخۆڕاییی، بایەخ بە شەش مانگەکەیە، بەڵام ئەگەر نیوەی وەرزەکە بەبەهابوو، وە ئەو نیوەکەی تری بە خۆڕاییی بوو، ئەوە سێ چواریەکی دەیەکی لێ دەکەوێ، واتە : سێ لە چل.

## زەکاتی زەوی بەکرێدراو، جا بە موڵکانە بێ، یا بە پارە بێ (زكاة الأرض المستأجرة)

کاتێ کەسێ زەوی کشتوکاڵ بە موڵکانە یا بە کرێ دەدا بەکەسێکی تر، زەکات چۆن دەدا؟ زانایانی شەرع را جیاییان هەیە، لەم بابەتە پرسیارانەدا، جەماوەری زانایان دەفەرموون : (زەکات لەکاتی وادا، ئایا دەیەك بێ یا نیوەی دەیەك بێ،

لەسـەر بـەکرێگرە، چـونکە زەکـات مافێکـە وا لـە بـەروبوومی زەوییەکـەدا دانەوێڵەکەیە، مافی وانییە کە لە خودی زەوییەکەدا بێ).

بەڵام پێشەوا ئەبو حەنیفە دەفەرموێ : (دەیـەك لەسـەر خـاوەن موڵکـە). هـەردوو مامۆستا ئەبو زەهرەو قـەرزاوی ئـەوە پەسـەند دەکـەن کـە زەکـات لەسـەر خـاوەن زەوی و بەکرێگر بێ، لەسەر ئەم شێوەیە:

١- خاوەن موڵك لەکۆی موڵکانەکە، یا لەکۆی کرێکە، دەیەکی دەدا بـە زەکاتـدا، یانیوەی دەیەکی دەدا بە زەکات بەپێی کات.

٢- بەکرێگریش لەسەرجەمی دەستکەوتی خۆی، دەیەکی یـا نیـوەی دەیـەکی دەدا بە زەکات بەپێی بارودۆخەکە، واتە : لە بەرهەمی کشتوکاڵەکەی، کرێی زەویەکەی لێ دەردەکا چی مایەوە دەستکەوتە، لەوە دەیەکی زەکاتی لێ دەردەکا.

## زەکاتی زێڕو زیو

هەرکاتێ ئەندازەی زێڕ گەیشتە بیست مـسقاڵ زێـڕی سـاغی بـێ خـەوش، کـە بـە کێشانەی باوی ئەم سەردەمە، دەکات (٨٥) گرام بەڕێـژەی ٢,٥٪ لـە سـەددا دوو نیو، زەکاتی لێ دەکەوێ، کە دەکاتە: چل یەك.

زیویش هەر کاتێ گەیشتە دووسەد درهەمی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە ددکاتـە (٥٩٥ گرام) چارەکی دەیەکی لێ دەکەوێ، کەدەکاتە: ٢,٥٪ دوو نیـو لـە سـەددا، واتە: یەك لە چل.

پـارەی کاغـەزیش - وەك دینـارو دۆلاری ئـەم سـەردەمەی ئێمـە - هـەر بـەزێڕ دەقەبلێنرێ، هەر کاتێ بەهاکـەی گەیـشتە بـایی (٨٥ گـرام زێـڕ) بەڕێـژەی ٢،٥٪ زەکاتی لێ دەکەوێ، بەمەرجێ ساڵی بەسەردا بێتەوە.

# زەکاتی خشڵ

خشڵ زێڕ کەمتر بێ لە (٨٥ گرام) زەکاتی لێ ناکەوێ، بەڵام ئەگەر گەیشتە ئەم ئەندازەیە یا پتر، لەناو زانایاندا راجیایی هەیە، رای دامەزراو لەلای من ئەوەیە: کە خشڵی ئاسایی‌و خشڵێ کە زۆربەی سال بەکار دەهێنرێ، زەکاتی لێ ناکەوێ، بەڵام خشڵێك کە هەر لە بۆنەو موناسەباتەکاندا بەکار دەهێنرێ، چونکە بەپێی بۆچوونی من بایەخ بە زۆرینەی ساڵە، بەپێوەرو پێك گرتن (قیاس)ی ئاژەڵی ئالیك خۆر.

بەڵام چاکتر وایەو ئەوە دووربین ترە : کە زەکاتەکەی بدرێ، ئەخوازەڵا لەم رۆژگارەی ئێمەدا، کە قات‌و قڕی‌و گرانی‌و برسێتی، باڵی کێشاوە بەسەر گەلێ لە وڵاتاندا، جا چاری ئەوەیە کە بە نرخی بازاڕی ئەو شوێنە نرخی بکرێ بە پارە، وەبەپێی رێژەی پارە چل یەکی لێ بدرێ بەزەکاتدا، بۆ رونکردنەوە ئەم نموونەیە دەهێنینەوە: ئەگەر خشڵێ لەبازاڕی دەوحەی وڵاتی قەتەر بایی (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار ریاڵی قەتەرێ بوو. زەکاتەکەی دەکاتە: ٢٥٠٠ دووهەزارو پێنج سەد ریاڵ لە ساڵێکدا.

ئەمە کاتێ وایەو بە دووربینی (ئەحوەت) دادەنرێ کە خشڵەکە لە سنووری خشڵی ئاسایی دابێ، بەپێی باوی ئاسایی ناو کۆمەڵگای ئەو شارە بێ، وە بەکاربهێنرێ‌و لەبەر بکرێ، دەنا ئەگەر سنووری ئاسایی بەزاند یا بە دەگمەن نەبێ بەکار نەدەهێنرا، ئەوە بەبێ چەندو چوون پێویستە زەکاتی لێ بدرێ.

مایەوە سەر خشڵی نادروستی پیاو، وەك کاتژمێرو قاپ‌و قاچاغ‌و یادگار (تحف)ە زێڕینەکان، یا زیوینەکان، ئەوە بەیەك دەنگ زاناکان دەفەرموون : لەم جۆرە خشڵەدا زەکات پێویستە.

## زەكاتی سامانی بازرگانی

### هەنگاوە كردەییەكان بۆ بازرگانی مسوڵمانان:

١- لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ماڵەكەدا، بازرگان سەرجەمی بازرگانیەكەی دەقەبڵێنێ بەپارە، بەپێی نرخی بازاڕی شاری خۆی، بەنرخی كۆ واتە: جوملە نەك تاك (مفرد). دیارە ئەوشتانەی كە لە پێویستییە دامەزراوەكانی بازرگانییە، كە پێشییان دەگوتری (كەرەستە نەگۆڕەكان: ئصولی ثابیتە) لەكۆی سامانەكە دەردەكرێ، ئەو كەرەستە نەگۆڕانەیش وەك : كۆگاو دوكانو گشت جێگەیەكی تری بازرگانیەكەی، وەك عەمارو خۆشڕۆیی كە بۆ بەرژەوەندی بازرگانیەكە بەكاربهێنرێن، هەروەها وەك نووسینگەو كۆمپیوتەری تایبەت، ئەم جۆرە پێویستییانە چونكە بۆ بەكارهێنانی كارەكەن - زەكاتیان تیا پێویست نییە.

٢- ئەوجا چەندە قەرزی وای هەیە لەسەر خەڵك كە بەتەمای ماوە، ئەویش دەخاتە سەر خەرمانی زەكات (وعاء الزكاة) وە چەندەیش قەرزی خەڵكی لەسەرە، لەكۆی خەرمانی زەكاتەكە دەری دەكات، ئەوجا لە پاڵفتەكەی بەڕێژەی ٢,٥% زەكات دەردەكا، بەمەرجێ بگاتە رادەی زەكات، كە بریتییە لە ٨٥ گرام زێڕ یان زیاتر.

بۆ نموونە: مەحموود بازرگانە، سامانی بازرگانیەكەی جۆرێ یا چەند جۆرێكە، لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ، سەرجەمی سامانی بازرگانییەكەی، دەور دەكاتەوە، جگە لە كەرەستە نەگۆڕەكان (ئصولی ثابیتە) بەپێی نرخی ئەو رۆژەی بازاڕ بە نرخی كۆ دەقەبڵێنرێ، دەردەكەوێ كە بایی سەد هەزار ریاڵە یان زیاتر، لەگەڵ قەرزێ كەئومێدی بەدانەوەی هەیە(٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار ریاڵە، ئەویش دەخاتە سەری (٣٠٠٠٠) سی هەزاریش قەرزارە، لێی دەردەكا ئاوا:

١٠٠٠٠٠ + ٥٠٠٠٠ = ١٥٠٠٠٠، ١٥٠٠٠٠ - ٣٠٠٠٠ = ١٢٠٠٠٠.

زەکاتەکەی دەکاتە (٣٠٠٠) سێ هەزار ڕیاڵ.

## ئەندازەی پێویستی زەکات لە سامانی بازرگانیدا

دووشت رادەو ئەندازەی زەکاتی پێویستیان یەکە:

دراوو سامانی بازرگانی، یەکگرتنی زانا ماقوڵەکان لەسەر ئەم بڕیارە دامەزراوە.

**ئایا دروستە زەکات لە خودی کاڵای بازرگانی دەربکرێ؟**

بنەڕەت (ئەصل) ئەوەیە: زەکات بەپارەیی لە سامانی بازرگانی قەبلێنراو دەردەکرێت بەپێی ئەو ئەندازەیەی کە پێویست دەبێت تێیدا، چونکە وا لەبارترە بۆ هەژار، چونکە هەژار دەتوانێت بە دراو زۆربەی پێویستییە جۆراوجۆرەکانی خۆی فەراهەم بهێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شەرع زانەکان ڕێگە دەدەن کە لە خودی سامانی بازرگانی زەکاتەکەی بدرێ، بەمەرجێ شتی وا بە کەڵك تربێ بۆ هەژار، یا لەکاتی بێ بازاڕیو کەم بوونی بەدەستەوەبوونی پارەو پولدا ببێ بەهۆی بارسووکی بۆ زەکاتدەر، لە راستی دا جاری واش هەیە قازانجی هەژار لەوەدایە کە زەکاتەکە بەماڵ وەربگرێ نەك بە پارە (ئەمە هاتووە لە فەتوای کۆڕی دوودەم سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەکانی زەکات) بڕوانە (المغني)ی ئیبن و قودامە (٣١/٣) کە باسی ئەوەی کردووە کە ڕێبازی (مەزهەب)ی جەماوەری زانایان ئەوەیە کە پێویستە زەکاتەکە بەپارە بدرێ.

## زەكاتی زەوی‌و زاری ئامادەكراو بۆ كڕین‌و فرۆشتن (بازرگانی پێوەكردن)
## (زكاة الأراضي المعدة للبيع والشراء - التجارة)

زەوی‌و زاری لەم جۆرەیش هەر لە سامانی بازرگانیە لەبەرئەوە لە كۆتایی ساڵدا دەقەبڵێنرێ بەپارە، بەنرخی بازاڕی ئەو شوێنە، ئەوسا لەكۆی بەهاكەی بەڕێژەی ٢,٥٪ زەكاتی لێ دەدرێ، واتە چل یەك. بەڵام ئەگەر لەبەر بێ بازاڕی زەویەكە نەدەفرۆشرا وەچەند ساڵی مایەوە، لەكاتی وادا جەماوەری زانایانی شەرع دەفەرموون : (هەموو ساڵێ دەیقەبڵێنێ بەدراو، بەنرخی بازاڕی رۆژ، وە بەڕێژەی خۆی لە نرخە قەبڵاودكەی زەكاتەكەی دەدا). بەڵام مالكیەكان دەفەرموون : (هەموو ساڵێ زەكاتی لێ ناكەوێ، بەڵكو كاتێ زەكاتەكەی دەدا كە دەیفرۆشێ). چونكە لای ئەمان بازرگانی رۆژانە فرۆش (التاجر المدير) جیاوازی هەیە لە بازرگانی قورخ كەر (التاجر المحتكر) كە شت هەڵدەگرێ بۆ كاتی قازانجی زۆر.

ئیبن‌و جەوزی دەفەرموێ : "لە راستیدا بازرگانی دەبێ بەسێ جۆرەوە: (رۆژانە فرۆشی، قۆرخ كردن، قازانج بەهاوبەش)..

١- **رۆژانە فرۆش ئەوەیە:** شت دەكڕێ‌و دەفرۆشێ‌و چاوەڕوانی كاتی تایبەت ناكاو سالڕۆژی رێك‌و پێكی نییە، وەك زۆربەی خەڵكی بازاڕ، جا ئەم جۆرە كەسە مانگێ لە ساڵ بۆخۆی دیاری دەكات، لەو مانگەدا چی پارەی نەختی هەیە سەرژمێری دەكاو، هەرچیش سامانی بازرگانی هەیە بە نرحی رۆژ بە پارە دەیقەبڵێنێ‌و لەگەڵ نەختینەكەیدا كۆیان دەكاتەوەو لە سەرجەمەكەیان زەكات دەردەكات، ئەگەر گەیشتە رادەی زەكات، ئەوەندە هەیە ئەگەر قەرزی لەسەر بوو، قەرزەكە لە سەرجەمی پارەكەی دەردەكات، چی مایەوە لەوە زەكات دەردەكات".

٢- **قۆرخكەریش ئەو كەسەیە:** كوتاڵ‌و كاڵاو شمەك دەكڕێ‌و هەڵیَ دەگرێ بۆ كاتی گرانبوون، ئەمە زەكاتی لەسەر نییە، هەتا دەیفرۆشێ، جا ئەگەر لە پاش ساڵێ یا

لە پاش چەند ساڵێ فرۆشتی، زەکاتی یەك ساڵی لێ دەردەکاو بەس. (بڕوانە القوانين الفقهية ص ١٠٣).

**تێبینی:**

ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر قازانج دا مەرج نییە، بایەخ بەوەیە کە ساڵ بەسەر سەرمایەکەدا وەرچەرخێ (مەبەست ئەو دەسمایەیە کە بگاتە رادەی زەکات) کەواتە: لەکۆتایی ساڵدا چەندەی قازانج دەست کەوتووە دەیخاتە سەر خەرمانی زەکاتەکە (وعاء الزکاة : دەفری زەکات)و لەکۆی سەرمایەو قازانج زەکات دەدا، بەڕێژەی ٢,٥٪ دوونیو لەسەد.

## زەکاتی ماڵی قازانج بەهاوبەشی

هەرکاتێ سامانی قازانج بەهاوبەش فرۆشراو هەمووی ساخ بۆوە پوختەبوو، وە قازانجەکەی دەرکەوت، وە کۆتایی بە مامەڵەکە هێنرا، ئەوکاتە زەکات لە کۆی سەرمایەو قازانج دەکەوێ، بەم شێوەیە:

١- خاوەن سامان زەکاتی سەرمایەکەو بەشە قازانجی خۆی دەدات.

٢- کارکەر (العامل) کە ئەو کەسەیە پارەکە دەگێڕێو بازرگانی پێوە دەکات، ئەویش لەسەر ئەم شێوەیە زەکات لەبەشە قازانجەکەی خۆی دەردەکا: لەلای هەندێ لە زانایانی شەرع، بەشە قازانجەکەی هەرچەندێ بێ، دەبێ زەکاتی لێ بدا، چ بگاتە رادەی زەکات، وە چ نەگاتە رادەی زەکات چونکە ئەم زاتانە دەفەرموون: ئەم جۆرە مامەڵەیە لە بابەتی سامانی تێکەڵە (الخلطة) زەکاتەکەی وەك ئەو دەدرێ، سامانی هاوبەشیش کۆی بەشەکان رەچاو دەکرێ نەك هەربەشەی بەجیا بەلاّم لەسەر رای زانایانی تر: کارکەر بەشە قازانجی خۆی دەخاتە پاڵ سامانەکانی تری، جا ئەگەر سەرجەمیان گەیشتە رادەی زەکات کە (٨٥ گرام زێڕە) بەڕێژەی یەك لە

چل ٢,٥٪ (چارەکی دەیەك) زەکاتەکەیان دەدا (سەرنجی الوسیط غەزالی — ١٠٩/٢ و فتح القدیر ٨٥/٦) بدریّ.

## زەکاتی کارگەکانو پرۆژە پیشەسازییەکان

هەرکەسێ کارگەیەکی پیشەسازی هەبێ، کەبەرهەمی هەبێ، لەسەریەتی کە زەکاتەکەی بدا، بەلاّم چۆن چۆنی؟ لەم بابەتەدا دوو را یا دوو ڕێگە هەیە:

**ڕێبازی یەکەم:** ئەوەیە کە یا لە پوختەی دەسکەوت (لەپاش لیّ دەرکردنی خەرجیو مەسرەف) بەرێژەی یەك لە دە زەکاتی لیّ دەربکریّ، بەپێوەری (قیاس)ی بەروبوومی زەوی، یاخود مەسرەفی لیّ دەرناکاو، بەرێژەی ٥٪ پێنج لەسەد زەکاتی لیّ بدا بەپێوەری بەوبوومی زەوی.

**ڕێبازی دووەم:** ئەوەیە کە کارگەکەی دابنێ بەماڵی بازرگانیو ڕێك وەك ئەو دەیقەبلێنێ بەپارە، ئەوسا بەرێژەی لەسەدا دوو نیو زەکاتی لێبدا، بەلاّم ڕێبازی یەکەم دوورین ترە، یا بلێین لەبارترە.

**لە فەتواکانی کۆڕی یەکەم، سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەکانی زەکات، کە لە (١٢ - ١٦)ی ڕەبیعی یەکەم ساڵی ١٤٠٩ك دا، بەسرا، هاتووە دەڵێ:**

### پرۆژە پیشەسازییەکان

لەپاش ڕەچاوکردنی بڕگەی شەشەم، لە فەتواکانی کۆڕی یەکەم، سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەکانی زەکات دەرکەوت: کە پرۆژە پیشەسازیەکان هەڵ دەگرن کە:

١- بەپێوەری زەویو زار زەکاتیان لیّ بدری، وا ڕەچاو بکریّ کە هەردوولایان دەسمایەیەکی نەگۆڕنو بەهۆی ئیش تیاکردنو مەسرەف بۆ کردنەوە دەستکەوتیان دەبێ، لەبەرئەوە بەرێژەی ٥٪ پێنج لەسەد لە بەرهەمەکەیان زەکات دەکەوێ.

٢- هەروەك دەگونجێ سەرمایەیەك كەلە پرۆژەی پیشەسازیدا بگێرِدرێو خرابێتە گەڕ، وەك سامانی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵدا بكرێو بەرێژەی ٢,٥٪ زەكات لەسەرجەمی سەرمایەو بەرهەم دەردەكرێ، ئەوەندە هەیە هەرچی بە كەرەستەی نەگۆڕ دابنرێ، بۆ هەڵسوڕاوانی ئەو كارە وەك گەزو دووكانو مێزو دەفتەرو قەڵەم زەكاتیان لێ ناكەوێت، دیارە كە ئەم بابەتە پێویستی بە لێكۆڵینەوەی زۆر تر هەیە، خوا یاربێ، با ئەمە بمێنێ بۆ كۆڕی ئایندە.

**لەفەتوای دەستەی شەرعی (الهیئة الشرعیة)یشدا. سەبارەت بە خەرمانی زەكات (مەحزەری كۆبوونەوە ٨٨/٥٤) هاتووە دەڵێ:**

(بنەماكانی زەكاتی سامانی پیشەسازی بریتین لە هەمان بنەماكانی زەكاتی سامانی بازرگانی، لە هەردوولایاندا بەم دەستوورە زەكات دەدرێ: (ئەو كالآیەی بەنیازی فرۆشتنەوە كڕاوە، بەنرخی رۆژی بازاڕ بەپارە دەقەبلێنرێ، وە زەكاتدەر چەندە پارەی تری هەبوو دەیخاتە سەر ئەو قەبلاوە، هەروا ئەو قەرزەیشی كەمانەوەی دەستەبەرە، ئەوجا چەندە قەرزی لەسەرە ئەوەی لێ دەردەكا، وەچی مایەوە لەوە زەكات دەردەكا) بەوێنە دەڵێین: بەهای سامانە قەبلاوەكە دەكاتە ٣٠٠٠٠ دینار، زەكاتدەر ٢٠٠٠٠ دینار قەرزی دەستەبەری هەیە، ١٥٠٠٠ دیناریش قەرزارە، كەواتە: ٣٠٠٠٠ + ٢٠٠٠٠ = ٥٠٠٠٠ — ١٥٠٠٠ = ٣٥٠٠٠).

بەڵام لەكاتی جێبەجێكردنی ئەم یاسایەدا ئەم خاڵە رەچاو دەكرێ كە دادەنرێ بەتەنیا جیاوازیەك كە هەیە لە نێوانی ئەم دوو بابەتەدا: كە بریتییە لەمە: لە سامانی بازرگانیدا زەكات لەسەرمایەو قازانج دەكەوێ، بەڵام لە سامانی پیشەسازیدا زەكات تەنیا لە قازانج دەكەوێ، لە سەرمایە ناكەوێ، چونكە زۆربەی

کات سەرمایەکە بەرەبەرە دەبێ بە کەردستەی نەگۆڕ، کەردستەی نەگۆڕیش بەشێوەیەکی گشتی زەکاتی لێ ناکەوێ، وەك ئامێرو کەرەستەو ئەو ساختمانەی کە کارگەکەی تیادایە، ئەمانە گشتیان بە ئامێری بەرهەمهێنان دەژمێردرێن، ئامێری بەرهەمهێنانیش زەکاتی لێ ناکەوێ.

هەروا ئەم خاڵەی تریش رەچاو دەکرێ: ئەو کەرەستە خامانەی کە شتیان لێ دروست دەکرێ لەو کارخانانەدا، ئەگەر بە خامیی لە عەمباری کارخانەکەدا مابوونەوە، هەتا ساڵیان بەسەردا هاتەوە، یا بەکارهێنران لە دروستکردنی بەرهەمەکانی کارخانەدا، بەڵام ئەو بەرهەمانە نەفرۆشران، هەتا کاتی زەکاتدان هاتە پێشەوە، ئەوە لەسەر ئەم شێوەیە زەکات لەو ماددە خامانە دەکەوێ:

یا دەخرێنە پاڵ پارەو پولی تری زەکاتدەرو بەو پێیە زەکاتیان لێ دەدرێ، یا دەخرێنە سەر ماڵی بازرگانی ترو بەپێی سامانی بازرگانی زەکاتیان لێ دەدرێ، بەڵام لەوە زەکات ناکەوێ کە نرخی ئەو ماددە خامانە زیاد کردبێ، بەهۆی کردنیان بە ئامێرو شتی واوە، مادام نەفرۆشراون.

## زەکاتی کانزاو زێڕو زیوی شاراوەی کۆنی دۆزراوە

هەموو کانزایەك چ رەق بێ وەك ئاسن چ شل بێ وەك نەوتو غاز، ئەگەر هی دەوڵەت نەبێ، بەرێژەی ٢,٥٪ زەکاتی لێ دەکەوێ، بەڵام لەسەر رێبازی پێشەوا ئەبو حەنیفەو لایەنگرانی (رەحمەتی خوایان لێ بێت) بەرێژەی پێنج یەك (٢٠٪) زەکاتی لێ دەکەوێ.

**هەندێك لە زانایانی شەرعیش دەفەرموون:**

هەر کانزایەك مرۆڤ بە ماندوویی و ئەرك بەدەستی بهێنێ، زەکاتەکەی چواریەکی دەیەکە، هەر کانزایەکیش بەبێ ماندووبوونێکی وا کە شایانی باس بێ بەدەست

بهێنرێ، پیچنج یەك زەكاتی لێ دەكەوێ، ئەمەش رایەكی پەسەندە، پێشەوا رافعی كە لە گەورە زاناكانی رێبازی شافیعیە دایمەزراندووە. (بڕوانە: الشرح الكبير على الوجيز للرافعي بهامش المجموع ٦/٨٩).

مەبەست لە زێڕو زیوی شاراوەی كۆنیش، كە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (ركاز) زێڕو زیوی دروستكراوە، كە لەدێرین زەمانەوە بووە بەژێر خاكەوە، ئەوە هەركەسێ بیدۆزێتەوە دەبێ بەخاوەنی، بەلاّم دەبێ پێنج یەكی بدا بەزەكاتدا (فقه الزكاة ٢/٤٣٤). بەلاّم زەكاتی ئەو شتانەی كە لە دەریا دەردەهێنرێن وەك مرواریو مەرجانو عەنبەر، ئەوە رای دامەزراو بەلای ئێمەوە ئەوەیە كە رێك وەك كانزا وایە، دەبێ بەدوو بەشەوە: هەر كاتێ بە ئەركو پارەو ماندوبوون دەرهێنران، چواریەكی دەیەكیان لێ دەكەوێ، دەنا پێنج یەكیان لێ دەكەوێ، ماسیش كە مەبەست لێی هەموو گیانلەبەرێكی ئاوییە كە گۆشتی بخۆرێ، ئەگەر بۆ خواردن بوو، زەكاتی لێ ناكەوێ، بەلاّم ئەگەر بۆ فرۆشتن بوو، بڕیارەكەی رێك وەك بڕیاری سامانی بازرگانی وایە.

## زەكاتی كۆمپانیاو قۆنتەراتەكان

بۆ كۆمپانیاكان سەرنج دەدەین: ئەگەر كۆمپانیاكە هی چەند كەسێكی دیار بوو، كەخۆیان دەیانبرد بەڕێوە، ئەوە لەكاتی وادا پێویستە لەسەریان كە هەركەسێ زەكاتی پشكی خۆی بدا، بەم شێوەیە: لەكۆتایی ساڵدا سەرجەمی سامانی كۆمپانیاكە دەوردەكەنەوەو، هەرچی تیادایە بەپێی نرخی كۆی رۆژ دەیقەبلێنن بەدراوی هەرەباو لە ولاّتدا، وە كەرەستە نەگۆڕەكانو قەرزی خەلّكی لێ دەردەكرێ، ئەگەر قەرزیان لەسەر خەلّك بووە بەتەمای مابوون، دەیخەنە سەر خەرمانی

زەکاتەکە، ئەوجا بەرێژەی ٢,٥٪ لە پوختەکەی زەکات دەردەکەن هەرکەسە بەپێی بەشی خۆی.

بەڵام ئەگەر کۆمپانیاکە هاوپشکی بوو، واتە: موساهیمە بوو، ئەوە حاڵ لەم دوو خاڵە بەدەر نییە:

**باری یەکەم:** کۆمپانیاکە خۆی زەکاتی سامانەکانی بدا، ئەویش تەنیا لەم کاتانەدا بۆی هەیە:

١- کاتێ یاسای بنچینەیی (نظام الأساس)ی کۆمپانیاکە بەدەق بڕیاریدا کە خۆی زەکات بدات.

٢- یاسایەکی وەها هەبێ کە کۆمپانیاکە ناچار بکا کە زەکات لە سامانەکەی بدا.

٣- بڕیارێ لە ئەنجوومەنی گشتی کۆمپانیاکەوە دەربچێ کە شەریکەکە خۆی زەکات بدا.

٤- هاوبەش و خاوەن پشکەکان بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بکەن بە بریکاری خۆیان، کە حیسابی زەکات بکا. بەپێی ئەم بڕگەیە کەسێکی ئاسایی چۆن زەکات دەدا، کۆمپانیاکەیش بەهەمان شێوە زەکات لە سامانەکەی دەردەکا، ئیتر کۆمپانیاکە هەرچی هەیە دەیقەبڵێنێ بەدراو، وەچەندە مافی سامانی لەسەر ئەم لاولا هەیە، حسابی دەکاو دەیخاتە سەر خەرمانی زەکاتەکە، وەچەندەی قەرز لەسەرە لێی دادەشکێنێ. وە کەرەستە نەگۆڕەکانیشی لێ دەردەکا، ئەوجا بەرێژەی ٢,٥٪ زەکات دەردەکا.

**باری دووەم:** هەرچی بەر ئەم چوار شێوەیە نەکەوێ دەستەی بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە مافی ئەوەی نییە کە زەکاتەکەی بدا، بەڵکو خاوەن پشکەکان خۆیان

زەکاتی پشکەکانیان دەدەن، بەپێی ئەو یاسایەی کە لە بابەتی زەکاتی پشکەکاندا روونی دەکەینەوە.

مەبەست لەو کەرەستە نەگۆڕانە کەلە هەبووە زەکات لە خۆگرەکان (مەوجوداتی زەکەوی) دەردەکرێن ئەم شتانەی دواوەیە، وەك لە فەتواکانی کۆڕی پێنجەم، سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەکانی زەکاتدا هاتووە، کە لە ١٨ — ٢٠ مانگی ناو جەژنانی ١٤١٥ك، لە لوبنان گیراوە.

## کەرەستە نەگۆڕەکان

کەرەستە نەگۆڕەکان بریتین لەو مەوجوداتە ماددیو مەعنەویانەی کە هی پرۆژە ئابوورییەکانن، کە بەنیازی ئەوە رادەگیرێن کە بەهرەیان لێ وەربگیرێ لە گشت چالاکییەکانی ئەو پرۆژانەدا، بۆ فرەبوونی بەرهەم، وە بەنیازی فرۆشتنەوە رانەگیراون، بە مەوجوداتە مادییە بەرهەمدارەکانیان دەگوترێ (المستغلات: بەرهەمهێنراوەکان) کە ئەمانەی بەردەکەون:

١- ئەو هەبووانەی کە رادەگیرێن بۆ بەهرە لێوەرگرتن لە پرۆژە بەرهەمیەکاندا، بەوێنەی ئامێرەکانی گواستنەوەو دەستگاکانی کۆمپیوتەر، ئەم جۆرە کەرەستە نەگۆڕانە زەکاتیان لێ ناکەوێ.

٢- ئەو هەبووە مادییانەی کە سەرچاوەی بەرهەمی پرۆژەکانن، وەك: مەکینەی دروستکەری بەرهەمەکەو خانووە بەکرێگیراوەکان، کە جێگەی پرۆژەکەن، ئەم جۆرەیش زەکات لە خودی شتەکان ناکەوێ، بەڵکو پوختەی بەرهەمەکەیان دەخرێتە سەر سامانەکانی تری زەکاتدەرو لەکۆی هەردوولا لەپاش ساڵڕۆژ، بەرێژەی ٢,٥٪ زەکاتیان لێ دەدا.

٣- هەر مافێکی بڕیاری (حەقی مەعنەوی) کە هی پرۆژەکە بێ، ئەگەر بەرهەمی لێ پەیدا بوو، لەبەرهەمەکەی زەکات دەکەوێ، ڕێك وەك جۆری دووەم، کەلە بڕگە دووی ئەم بابەتەدا باسی لێکرا. ئەمەیش بەپێی بڕیارەکانی کۆڕە فیقهیەکان، کە لەم بابەتە کۆڵیونەتەوە، وەك: کۆڕی لێکۆڵینەوە ئیسلامیەکان، کە لەمیسر گیراوە، کە لە کۆنگرەی دووەمیدا لە ساڵی ١٣٨٥ك. بەرامبەر بە ١٩٦٥ز. دا گیراوە، ئەم بڕیارەی داوە، هەروا کۆڕی فیقهی ئیسلامی کە سەربە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییە، لە خولی دووەمیدا کە لە (جیددە) بەسترا، ساڵی ١٤٠٦ك، ١٩٨٥ز. و کۆنگرەی یەکەمی زەکات کەلە کوەیت لە ساڵی ١٤٠٤ك، ١٩٨٤ز. دا گیرا، بەزۆرینەی دەنگی ئەندامەکانی.

٤- ئەو بڕە پارەیەی تەرخان دەکرێ بۆ خەرجی کەرەستە نەگۆڕەکان، لە هەبووە زەکات لەخۆگرەکانی پرۆژەکە دەرناکرێ، چونکە تەنیا ئەو خەرجیانە لەو مەوجوداتانە دەردەکرێن کە بۆ خودی ئەم مەوجوداتانە بکرێن، دەی ئەم کەرەستانە زەکات لەخۆگر نین.

## چۆن چۆنی ئەم یاسایە جێبەجێ دەکرێ؟

ئێمە گوتمان: کۆمپانیای فرەپشك (کۆمپانیای هاوپشك: شەریکەی موساهیمە) دووباری هەیە: **باری یەکەم**، کۆمپانیاکە خۆی زەکات دەردەکا، **باری دووەم**، خاوەن پشکەکان خۆیان زەکات دەردەکەن، جا زانینی ئەم باری دووەمە ئاوا دەبێ: (لە پێشدا تێکڕای کۆی مافەکانی هاوپشکەکان دەدۆزینەوە، ئەوجا ئەوەی تایبەتمەندبێ بە کەرەستە نەگۆڕەکانەوە لێی دەردەکەین، ڕێك وەك لە پێشەوە رابورد، ئەوجا پوختەکەی دابەش دەکرێ بەسەر ژمارەی پشکەکاندا، سەرەنجام گشت خاوەن پشکێ، لەسەرمایەو قازانج چەندی بەردەکەوێ ئاشکرا دەبێ، ئەوجا

بەپێی ئەو سەرەنجامە هەرکەسەی بەرێژەی ٢,٥٪ لە پوختەی بەشی خۆی زەکات دەردەکات).

بەوێنە: کۆمپانیای سەرکەوتن، سەرمایەکەی یەك ملیۆن ریاڵە، هی دە هەزار پشکە، واتە ١٠٠٠٠٠٠ ÷ ١٠٠٠٠ = ١٠٠ ریاڵ، کە بریتییە لە ئەندازەی یەك پشك مەحموود هەزار پشکی هەیە لە هەموو سەرمایەکە کە دەکاتە: ١٠٠٠ × ١٠٠ = ١٠٠٠٠٠ ریاڵ. نۆ هەزار پشکەکەی تریشی هی چەند هاوبەشێکی ترن، دەرکەوت نرخی ناوبراوی هەر پشکێ دەکاتە سەد ریاڵ لەکاتی تەرازووکردنی (میزانیە)ی سەری ساڵدا دەرکەوت کە کۆمپانیاکە قازانجی کردووە، نرخی پشکی دەفتەری واتە: سەهمی دەفتەری، کە بریتییە لە پشکی ناوبراو قازانجی لە ساڵێکا - گەیشتووەتە (١٥٠) ریاڵ، واتە: تێکڕای کۆی مافەکانی هاوپشکەکان دەکاتە : ١٠٠٠٠ × ١٥٠ = ١٥٠٠٠٠٠ یەك ملیۆنو پێنج سەد هەزار ریاڵ. ئەوجا قەبڵێنراوی نرخی کەرەستە نەگۆڕەکانی لێ دەردەکەین، با بڵێین دەکاتە (٣٠٠٠٠٠) سێ سەد هەزار ریاڵ، کەواتە دەمێنێتەوە (١٢٠٠٠٠٠) یەك ملیۆنو دووسەد هەزار ریاڵ دابەشی دەکەین بەسەر (١٠٠٠٠) دە هەزار پشکدا، هەر پشکێ دەکاتە (١٢٠) ریاڵ. کەواتە لەسەر مەحمودە زەکاتی (١٢٠ × ١٠٠٠) بدات سەرجەم دەکاتە (١٢٠٠٠٠) سەدو بیست هەزار ریاڵ، بەرێژەی ٢,٥٪ وەکی تریش دەبینین: تەرازوو کردنی کۆمپانیاکە بەپێی ساڵی رۆژی حساب دەکرێ، زەکاتی سامانیش بەپێی ساڵی هەیڤی دەدرێ، ساڵی رۆژی دەوری دە رۆژی زیاترە لە ساڵی هەیڤی، کەواتە: لە ساڵی کەبیسەدا رێژەکەی دەبێ بە (٢,٥٧٧٪) لە ساڵی بەسیتەیشدا دەبێ بە (٢,٥٧٧٪) جا بەم پێیە زەکاتی مەحمود لەم ساڵەدا ئەگەر کەبیسە بێ دەکاتە: ١٢٠٠٠٠ ÷ ١٠٠ × ٢,٥٧٧ = ٣٠٩٢,٤ سی هەزارو نەوەدو دوو ریاڵو چل درەم.

کورتو پوخت خاوەن پشك دەتوانێ لە دەفتەردار (ژمێریار)ی کۆمپانیاکە بپرسێ، یا لە سکرتێرەکەی، نرخی پشکی دەفتەری چەندە، رێژەی کەرەستە نەگۆڕەکانو سەرمایەکانو بەدەستەوە بووی هەنووکەیی نەگۆڕ چەندە، ئەوکاتە بە ئاسانی دەزانێ کە زەکاتی پشکەکانی خۆی دەکاتە چەند یا بەهۆی تەرازووکردنی کۆمپانیاکەوە گریمان خاوەن پشك زانی، کە نرخی پشکی دەفتەری (١٥٠) ریاڵەو، رێژەی کەرەستە نەگۆڕەکان دەکاتەوە ١٠٪ ئەمە واتای وایە: مەبەست ئەمەیە کە ژمارەی پشکەکانی لەم برە ئاوا بدات:

١٠٠٠ × ١٣٥ = ١٣٥٠٠٠ ئەوسا: ١٣٥ × ٢,٥٧ = ٣,٤٧٠ ریاڵ.

وە دەشتوانێ لەسەر ئەم شێوەیەی تریش، رێژەی زەکات لە هەموو پشکێ بدۆزێتەوە: ١٣٥ × ٢,٥٧ = ٣,٤٧٠ ریاڵ. واتە : سێ ریاڵو حەوت درەمی قەتەری، ئەوجا ژمارەی پشکەکانی لەم سەرەنجامەیدا، وە هەروەها.

بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئەمە بزانێ، ئەوا با دەیەکی (١٠٪) پوختەی ئەو قازانجە بدا، کە لە گشت پشکەکانی وەری دەگرێ، وەخودا بۆخۆی باشتری لێ دەزانێ.

لەم بارەیەوە چەندین یاساو باسی دوورو درێژی ژمێریاری هەیە، پوختەیەکیان لێ راگوێز دەکەین، بەکەمێ گۆڕانەوە، کە لە (دليل الإرشادات لمحاسبة زكاة الشركات) وەرگیراوە کە لیژنەیەکی پسپۆڕ هەستاوە بە ئامادەکردنی، لە زانایانی شەرعو ژمێریاران، کە ئەم زاتانەن: د. عبدالستار او غدة ، د. سليمان الأشقر ، د. محمد عبدالغفار الشريف ، د. اسامة شلتوت، دهمان عوض دهمان ، منصور عثمان الفريح ، محمد الشعيل.

**ئەمەیش کورتەی ئەو یاسایانەیە :**

١- بنەڕەت لە رەچاوکردنی ساڵڕۆژدا ساڵی کۆچیە، بەڵام بەپێی شەرع دروستە کە ساڵی رۆژی رەچاو بکرێ، بەمەرجێ زیادەی رۆژەکانی بەسەر رۆژەکانی ساڵی

هەیڤیـدا رەچـاو بکـریٚ لـەکاتی وادا ریٚژەکـە زیـاتر دەکـریٚ لـە (٢,٥) دەکـری بـە (٢,٥٧٧).

٢- دەشگونجیٚ چارەسەری کەرتەکانی بکریٚ بەم شیٚوەیە، بخریٚتە سەر حسابی سالٚی دوایی، بەویٚنە: گریمان کۆمپانیاکە لە ناوەڕاستی سالٚدا دەست پیٚ دەکا، لەبەرئـەوە لە سالٚی یەکەمدا حسبابەکەی بۆ تەرازوو نـاکریٚ ئـیتر لـە سـالٚی دووەمـدا شـەش مانگی سالٚی یەکەمیش تەرازووگەری دەکات، تەرازووی (١٨) مانگ ریٚك دەخـا، لەگەلٚ رەچاوکردنی زیاتریی سالٚی رۆژی بەسەر سالٚی هەیڤی دا، لەبەرئەوە ژمارەی رۆژەکان دەکاتە: (٥٤٨) وە بەپیٚی ئەوە زەکاتەکەی دەدۆزیٚتەوە.

٣- ئەو هەموو کەرەستە نەگۆڕانـەی کـە نـاودارن بـە (عـروضی قونیـە: سـامانی راگیراو: شمەکی ناومالٚ) وەك: زەویو خانووبەرەو نامیٚرو کەلوپەلی ناومالٚ، ئەمانـە زەکاتیان لیٚ ناکەویٚت.

٤- هەر کەرەستـەیەکی نـەگۆڕ خرایـە ئیـشەوەو دەسـتکەوتی هـەبوو، لـە خـودی کەرەستەکان زەکات ناکەویٚ، هەروەها لە بەهاکەیشیان زەکات ناکـەویٚ، بـەلاٚم لـە دەستکەوتەکەیان زەکات دەکەویٚ، کریٚو قازانجو بەرهـەمیان دەخریٚتـە سـەر شـتە زەکات لەخۆ گرەکانی زەکاتدەر، ئەوەندە هەیە هـەرکاتیٚ ئـەم کەرەسـتە نەگۆڕانـە فرۆشران، لە نرخەکەیان زەکات دەکەویٚ.

٥- کەرەسـتە نـەگۆڕەکان، ئەوانـەیان کـە دەسـت دەدەن بـۆ ئـەوە کـە بازرگـانی دریٚژخایـەنیان پیٚـوە بکـریٚ، وەك خانووبـەرەو زەویو زار، کـە زۆرکـات کۆمپانیـا بەرهەمهیٚنەکان بەنیازی بازرگانی پیٚوە کردن دەیان کڕن، ئەم جۆرە لەکاتی وادا کە بـەم نیـازە بکـڕدریٚ، دەبـیٚ بـەنرخی رۆژ، بـەپیٚی بـازاڕ بقـەبلیٚنریٚ بـەدراو، وە نرخەکەیان بخریٚتە سەر خەرمانی زەکاتو زەکاتی لیٚ دەربکریٚ.

٦- خانووبەرەو بەرهەمهێنراوە درێژخایەنەکان، کە لەبەندی جێبەجێکردندابن، وەك ئەو پرۆژانەی خانووسازی، کە لەپاش تەواوکردنیان دەست دەکرێ بە فرۆشتنیان، ئیتر چ خانوی ئاسایی بن، چ ساختمانی گەورە بن، ئەمانە پێویستە بە نرخی رۆژی بازار، لەکۆتایی ساڵدا بقەبلێنرێن بەپارە، نرخی زەویەکەو نرخی خانووکەو نرخی ئەو بەشەی کە لە خانووەکە تەواو بووە، لەگەڵ نرخی ئەو کەرەستانەدا کە بۆ تەواوکردنی ئامادە کراون، لەکۆتایی ساڵدا لە سەرجەمی ئەم نرخە قەبلێنراوانەدا زەکات دەردەکرێ.

٧- ئەو برە پارە تەرخان کراوە بەناوی ئیستیهلاك بوونی کەرەستە نەگۆڕەکانەوە، کە بریتییە لە ئەندازەی ئەو دابەزینە کە لە نرخی کەرەستەکانا، بەهۆی کارپێکردنەوە پەیدا بووە، لەگەڵ خەرجی دیاریکراو بۆ پاراستنو میرازو نوێکردنەوە، ئەم برە پارانە هەموویان زەکاتیان لێ دەکەوێو دەخرێتە سەر خەرمانی زەکاتی کۆمپانیاکە.

٨- گشت قازانجەکان دەخرێنە سەر خەرمانی زەکات، بەڵام زیانەکان هەر لە بنچینەوە لێی دەرکراوە لەبەرئەوە لەکاتی نرخاندندا ناخرێنەوە سەری!

٩- قازانجە سوود لەخۆگرەکان: ئەگەر کۆمپانیاکە بەسوود پارەی وەرگرت، یا پارەی بەسوود دا بەکەسێ، ئەوە بەرپرسیارە لەم جۆرە مامەڵەیە لەلای خودای گەورەو تاوانبارە، بەڵام دەبێ دەستکەوتە مسۆگەرەکانی کۆمپانیاکە لەم جۆرە سوودە بەدووربن، پێویستە کۆمپانیاکە خۆی لەم سوودانە رزگار بکاو نەیانخاتە سەر خەرمانی زەکات.

١٠- قایەکاری (إحتیاطي) بەهەموو جۆرەکانیەوە، چ بەرهەمی بێ، چ یاسایی بێ، چ ناچاری بێ، چ بە ئارەزوو بێ چ لەبەشی قایەکاری قازانج بێ، وە چ لە

بەشی قایەکاری سەرمایە بێ، لە ریزی هەبووە زەکات لەخۆگرەکان (الموجودات الزكوية) حساب دەکرێن‌و زەکاتیان لێ دەدرێ.

١١- بڕیاردراوی بازاڕ شکانی ڕەچاوکراو (مخصص هبوط المحتمل) چ بۆ نرخەکان بێ، چ بۆ بەرهەمهێنراوە درێژ خایەنەکان (الإستثمارات الطويلة الأجل)بێ لە هەبووە زەکات لەخۆگرەکان دەرناکرێ.

١٢- هەموو کردارە خانووسازییەکان (الأعمال الإنشائية) کە پێویستیان بە خستنەسەری کەرەستەی خامی تر هەیە، دەخرێنە پاڵ خەرمان‌و بەپێی نرخی بازاڕ زەکاتیان لێ دەردەکرێ، تەماشای نرخی تێچوون (سعری کولفە) ناکرێ، بەڵام هەموو کارێکی خانوو سازی کە پێویستی بە کەرەستەی خام نەبێ، وەك بناغە هەڵکەندن‌و کردارەکانی ڕماندن‌و لابردن، ئەم جۆرە کارانە شتی ماددی وایان تیادا نییە، کە قەبولی قەبلاندن بکات، لەبەرئەوە بایەخ بەوەیە کە بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەو کارە وەردەگیرێ، ئەو بەرامبەرە دەخرێتە سەرخەرمانی زەکات، ئەو زەویەش کە پرۆژەی خانووبەرەی لەسەر دروست دەکرێ، بەنیازی فرۆشتنیان لەپاش تەواو بوونیان،ئەم زەویە زەکاتی لێ دەکەوێ.

١٣- ئەو کەرەستە خاوانەی کە لە زات (عەین)ە کەیان لەناو دروستکراوەکاندا دەمێنێتەوە، بەنرخی بازاڕی ڕۆژ، زەکاتیان لێ دەدرێ. بەڵام ئەو کەرەستانەی کە لەکاتی دروستکردندا ڕۆڵێ دەبینن، بەڵام لەپاش بەکارهێنانیان لەناو دەچن‌و نامێنن، وەك: کەرەستەی پاکسازی‌و مەوادی تەعقیم‌و پاکژیکردن‌و سووتەمەنی، ئەمانە بەر قەبلاندن ناکەون، چونکە بەنیازی بازرگانی پێوەکردنەوە نەکڕاون‌و لەکاتی فرۆشتنی کاڵاکەیشدا مولکایەتییان نەقڵ نابێ بۆ کڕیار.

١٤- پارچەی یەدەك (قطعەی غەیار) بۆ ئامێرو دەسگاکان، کەبۆ بەرهەم هێنان بەکار دەهێنرێن، کە ناودار بە سامانی راگیراو (عروضی قونیە) پارچەی یەدەك بۆ ئەمانە، چونکە بەنیازی بازرگانی پێوەکردن نەکڕاون، زەکاتیان تێدا نییە.

١٥- کالآیی لەرێ بێ: مەبەست لەو جۆرە کالآیەیە، کە کۆمپانیایەك یا بازرگانێ داوای کردووەو کڕیویەتی، بەلآم هێشتا کالآکە بەرێوەیەو وەرنەگیراوە، ئەوەی کە ئێمە بەڕای دامەزراوی دادەنێین ئەمەیە: ئەگەر بەهاکەی درابوو دەقەبلێنرێ بەو ئەندازە پارەیەی کە پێی کڕدراوە، بەلآم ئەگەر بەهاکەی نەدرابوو، ئەوە پێویستە زەکات لەو بڕە پارەیە بدرێ کە ئامادەکراوە بۆی کراوە بە ئیعتیمادو بارمتەی ئەوەك لە نرخی بازاڕی کالآکە.

١٦- قەرزە فەوتاوەکانی کۆمپانیاکان، کەلەجێی نەبوون، بەرشتە زەکات لەخۆگرەکان ناکەون، بەلآم ئەگەر وارێکەوت کە لەپاش سالێ، یا زیاتر، دەست کۆمپانیا کەوتەوە، ئەوە زەکاتی یەك سالی لێ دەدرێ.

١٧- ئەو دراوە بارمتانەی کە بەناوی تەئمیناتەوە بۆ دلنیایی لەلای کڕیاری کۆمپانیاکە دادەنرێن، بۆ دابینکردنی جێبەجێکردنی بەلێنو دەستەبەربوونی کۆمپانیاکە، هەتا گرێدراوەکان بەپێی مەرجە بڕیاردراوەکان ئەنجام بدرێن، زەکات لەم بڕە پارەیە پێویست نییە، هەتا لەلای کڕیارەکان بێ، بەلآم لەپاش سالێ، یا زیاتر، ئەگەر کۆمپانیاکە وەری گرتەوە لەکڕیارەکان، زەکاتی یەك سالی لێ دەدا، چونکە خاوەنێتی کۆمپانیاکە بۆ ئەو پارەیە لەو ماوەیەدا خاوەنێتیەکی ناتەواوە.

١٨- گشت دەرامەتێکی بەمافبوونی کۆمپانیاکە، کە تایبەت بێ بە سالی دارایی هەنووکەوە، دەخرێتە سەر خەرمانی شتە زەکات لەخۆگرەکان، با لەپێش سەری سالیشدا وەرنەگیرابن.

١٩- سپارده (وەدائیع)و حسابە ئاسانگەرەکان (الحسابات الجاریة) بەر زەکات لەخۆگرەکان دەکەونو زەکاتیان لێ دەکەوێ، بەڵام دەرامەتی سوود لەخۆگر (الفوائد الربویة) نابێ نەبۆخۆی بیخوا، نە زەکاتی لێ بدا، بەڵکو دەبێ خۆی لێ رزگار بکات.

٢٠- گشت داخوازیەکانی سەر کۆمپانیاکە، وەك قەرزەکانی سەری، لە خەرمانی زەکات دەردەکرێ، مەگەر بەو قەرزو داخوازیانە شت وەرگیرابێو لەلای کۆمپانیاکە بێ؟

٢١- هەموو خەرجیەکی مسۆگەر بوو لە خەرمانی زەکات دادەشکێنرێ (مسۆگەربوو: المستحقة).

٢٢- دەرامەتە پێشەکیە وەرگیراوەکان دەخرێنە سەر خەرمانی زەکات.

٢٣- باجو گومرگی پێویست بوو (الضرائب المستحقة : باجە پێویستبوەکان) لە خەرمانی زەکات دادەشکێنرێن، چونکە وەك قەرزێ وایە کە لەسەر کۆمپانیاکە بێ.

٢٤- قازانجێ ئامادەبێ بۆ دابەشکردن، لە خەرمانی زەکات داناشکێ، بەڵکو زەکاتی لێ دەدرێ، هەتا بڕیاری دابەشکردنیشی دەرچووبێ، چونکە لەکۆتایی ساڵی زەکاتدا موڵکی کۆمپانیاکەیە، هەتا سەری ساڵی دارایی نوێ، خاوەن پشکەکان نابن بە خاوەنی.

٢٥- بارمتە پێشەکییەکانی کڕیارەکان، کەلەلای کۆمپانیاکە دانراون، بۆ تەئمینات، لە خەرمانی زەکات دەردەکرێن، چونکە ئەوانە قەرزی راستەقینەنو وان لەسەر کۆمپانیاکە (بارمتە پێشەکی : التأمینات المقدمة).

٢٦- خەڵاتی پشوی کارمەندان (مخصص الإجازات) کە بەپێی یاسا چەسپاون، لە خەرمانی زەکات دانەشکێ.

٢٧- پاداشتو خەلاتی کۆتایی خزمەتی کارمەندانی کۆمپانیاکەیش بە تەواوی لە خەرمانی زەکات دەردەکرێ.

٢٨قازانجە دەست بەسەرەکان، کەلە بەرهۆیێ دابەش نەکراون، لەگەلّ قازانجە هەلّگیراوەکان (المحتفظ بها) لە خەرمانی زەکات دەرناکرێنو زەکاتیان لیّ دەدرێ.

٢٩- هەموو مەسرەفێکی راستی (فعلي) لە خەرمانی زەکات دەردەکرێ.

## زەکاتی پشکەکان (زکاة الأسهم)

لە زمانی عەرەبیدا (الأسهم) کۆی (سهم)ە بریتیە لە بەشێك لە سەرمایەی کۆمپانیا، ئەو بەشەیە کە دابەش دەکرێت بەسەر تەواوی بەهای کۆمپانیاکەدا، ئەوەی تۆمار دەکرێت بەهایەکی دیاری کراوی هەیە بە دراو، بە هەموو پشکەکانی سەرمایەی گشتی کۆمپانیاکە پێك دەهێنێنن، کە هەموویان یەك نرخیان هەیە، هیچ کەسێك رای جیاوازی نی یە لەسەر ئەوەی کە پێویستە زەکاتی پشکەکانیش بدرێت، بەلاّم جیاوازی هەیە لەسەر شێوازو بڕی زەکاتەکە، لەم بارەیەوە .

فتوایەك دەرچوو لە کۆنگرەی یەکەمی زەکات کە لەدەولّەتی کوێت لە سالّی ١٤٠٤ دابەسترا دەربارەی چۆنیەتی دیاری کردنی زەکاتی کۆمپانیاو پشکەکان:

١- ئەگەر کۆمپانیاکە بەسەر یەکەوە زەکاتەکەی دەدا، ئەوا ئەوە وەك کەسێك وایە کەبەشێوەیەکی سروشتی بەپێی جۆری مالّەکەیو سروشتی مالّەکە زەکات دەدات بەوڕێژەیەی کە شەرع دیاری کردووە، بەلاّم ئەگەر کۆمپانیاکە بەیەکەوە زەکاتەکەی دەرنەکرد ئەوا خاوەن پشکەکە پێویستە زەکاتەکەی دەربکات بەم دوو شێوازەی خوارەوە .

حاڵەتی یەکەم : زەکاتەکەی بەپێی کڕینو فرۆشتنی پشکەکە حساب بکات ئەویش بە دەرکردنی ڕێژەی ٢,٥٪ شکاندنەوەیەتی بەپێی بەهای بازاڕی ئەو ڕۆژە، ئەمەش وەك هەموو کەرەستەیەکی بازرگانی وایە .

حاڵەتی دووەم : لە کاتێکدا کە ئەوکەسە سوودی لە قازانجی ساڵانەی ئەو پشکانە وەرگرتووە، لەم حاڵەتەدا زەکاتەکە بەم شێوەیە دەبێت :

أ- دەتوانیت لە ڕێگەی کۆمپانیاکەوە زەکاتی گشتی پشکەکان بزانیتو ئەویش چەندی بەرکەوت دەتوانیت بەڕێژەی ٢,٥٪ لە پشکەکە بدات .

ب- ئەگەر نەیزانی ڕێژەی زەکاتی ساڵانەی کۆمپانیاکە چەندە ئەوا:

١-خاوەن پشکەکە دەتوانێت لەگەڵ هەموو سامانەکەی تریدا کە ساڵێکی بەسەرداتێپەڕ دەبێت .

ئەویش بە ڕێژەی ٢,٥٪ زەکاتی لێبدات .

٢- لە هەمان کاتدا زانایانێکی دیکە ڕایان وایە دەتوانین ڕێژەی ١٠٪ لە قازانجەکەی بدات بە زەکات لەکاتی وەرگرتنی قازانجدا ئەویش بە پێوەری لەسەرداهاتی زەوی کشتوکاڵی .

## چۆنیەتی ئەندازە دانانی زەکاتی کۆمپانیاکانو پشکەکان

أ- ئەگەر کۆمپانیا خۆی زەکاتی دەردەکرد،ئەوە کەسێکی ئاسایی چۆن زەکاتی سامانەکەی دەدا، ئەمیش ئاوا دەیدا، بەپێی سروشتی سامانەکانیو بەپێی جۆرەکانیان ئەندازەی یاسایی (شەرعی) خۆیانیان لێ دەردەکا.

ب- بەڵام ئەگەر کۆمپانیاکە زەکاتی دەرنەدەکرد ئەوە لەسەر خاوەن پشکەکانە هەرکەسەیان زەکاتی پشکەکانی خۆی بدا، بەپێی یەکێ لەم دوو شێوەی خوارەوە:

**شێوەی یەکەم:** ئەوەیە کە ناڵو وێڵ بە پشکەکانی خۆیەوە بکاو پشکەکانی بۆ ئەوە کڕیبێ کە بیانفرۆشێتەوە بە قازانج، ئەوە دادەنرێ بە سامانی بازرگانی، لە

کۆتایی ساڵ لە سەرمایەو قازانج بەرێژەی ٢,٥٪ لە نرخی بازاڕی، بەنرخی رۆژی پێویستبوونی زەکات تێیدا، زەکاتی لێ دەدا.

**شێوەی دووەم:** ئەوەیە کە پشکەکانی بۆ ئەوە وەرگرتبێ کە قازانج لە داهاتی ساڵانەیان بکا، زەکاتی ئەم جۆرەیان بەم شێوەیەیە کەوا دێت:

١- هەرکاتێ دەیتوانی، کە لە رێگەی کۆمپانیاکەوە، یا لە رێگەیەکی ترەوە، ئەندازەی ئەو زەکاتە بزانێ، کە لەیەک پشکی زەکات لەخۆگر دەکەوێ، ئەوە زەکاتی پشکەکانی بەرێژەی ٢,٥٪ دەدا، کە دەکاتە چواریەکی دەیەک، واتە چل یەک.

٢- بەڵام ئەگەر نەیدەتوانی کە ئەمە بزانێ، **ئەوە چەند رایەك لەم بارەوە هەیە:**

أ- زۆرینەی زانایان دەفەرموون: خاوەنی پشك داهاتی ساڵانەی دەخاتە سەر سامانەکانی تری، بەپێی ساڵڕۆژی رادەی سامانەکانی تری ساڵڕۆژو رادەی پشکەکانیش دیاری دەکا، ئەوسا لەگشت سامانەکەی بەرێژەی ٢,٥٪ چوار یەکی دەیەك زەکات دەردەکا، ئیتر ئەستۆی خاوێن دەبێتەوەو پاك دەردەچێ.

ب- هەندێکی تر دەفەرموون: دەستبەجێ هەر لەگەڵ چەردەیێ قازانجی وەرگرت، بەبێ چاوەڕوانی کردنی ساڵڕۆژی دەیەکی ئەو قازانجە (١٠٪) دەدا بە زەکاتدا، بەپێوەر (قیاس) لەسەر زەکاتی دانەوێڵە.

ج- ئەم رایەیان دووربینی پتری تیادایە، چونکە بایسی قیاس کردنی لە دانەوێڵە روونو ئاشکرایە.

## زەکاتی کۆمپیالەی کاغەزیو چەك و سەرمایەی بەرهەمهێنراو

مەبەست لە کومپیالە، لەم شوێنەدا، سەنەداتە، کە وشەیەکی عەرەبیەو کۆی سەنەدە، کە لە زمانی عەرەبدا بە واتا: پشت پێ بەستنو دڵ پێ نیاز بوونە. لە زاراوەی باوی ئابووری نوێدا، بریتییە لە بەڵگەنامەیەك، نرخێکی دیاری تایبەتی هەیە، سەرچاوەی دەرکردنی ئەو بەڵگەنامەیە، دەستەبەر دەبێو بەڵێن دەدا، کە لە مێژوویەکی دیاری دا، وەك ساڵێ یا کەمتر یا زیاتر، قازانجێکی دیاریکراوی ساڵانە یا مانگانە یا خولەکی (دەوری)بدا بە خاوەنەکەی، بە بێژەیی تر: بریتییە لە چەکێ، قەرزی خاوەن قەرزەکەی پێ ساغ دەبێتەوە، نرخێکی ناوبراوی هەیە، قازانجی ساڵانە ئامێزی هەیە، گەلێ جۆری هەیە. کەواتە: کۆمپیالە یا چەك بەم واتایە، قەرزێکی قازانجدارە، هەموو قەرزێکیش قازانج ئامێز بێ سوودەو نادروستە، سەبارەت بەم بابەتە چەندین فەتواو بڕیاری شەرعی لەلایەن کۆڕە فیقهیەکانەوە دەرچووە، بەڵام پێویستە لەسەر مایە قەرزەکە، واتا: ئەصلی سەرمایەکە، بەرێژەی ٢,٥٪ زەکات بدرێ، چونکە لەو جۆرە قەرزانەیە کە ئومێدی دانەوەی هەیە، لەهەمان کاتدا پێویستە لەسەریشی کە خۆی لەو زیادەیە کە بەناوی قازانجی ئەو قەرزەوە وەری دەگرێ رزگار بکات، چونکە ئەوە سوودە، بۆ قازانجی لایەنە گشتییەکان خەرج دەکرێن لە کۆنگرەی یەکەمی زەکاتەوە، کەلە ١٤٠٤ك دا لە کوەیت گیرا، فەتوایەك لەم لایەنەوە دەرچوو.

بەڵام ئەگەر کومپیالەو چەکەکان لە جۆرێ دروست بوون، وەك ئەوە لەبەشی بەرهەمهێنراوی رەوابن، وەك چەکەکانی قازانج بەهاوبەشو چەکەکانی هاوبەشایەتی، کە چەن کەسێ بەهاوبەشی برۆژەیەك دەکەنەوە، هەرکەسەیان بەچەند پشکێ هاوبەشی تیا دەکا، چەند کەسێکیش ئیشی تیادا دەکەن، ئەوە لەم جۆرە مەسەلەیەدا لەو بڕەپارەیە، لەسەرمایەو دەسکەوت کە بووە بەماف، زەکات

دەکەوێ، چونکە ئەوە لەبابەتی قازانج بەهاوبەشە، کە حەڵاڵە چونکە زیانو قازانج بەهاوبەشە.

## زەکاتی سپاردەی بەرهەمهێنراو، سندوقی پاشەکەوتو سەودای ئاسنگەر

(زكاة الودائع الإستثمارية والتوفير وصناديق الإستثمارات والحساب الجاري)

لە کۆتایی ساڵدا بەڕێژەی ٢,٥٪ لەسەرمایەو قازانج زەکات دەدرێ: لە سپاردەی خاوەن بەرهەمو لە حیسابی پاشەکەوتو لە سندوقی بەرهەمهێنانو گشت جۆرە ماڵی کە بە قازانجو هاوبەشی بازرگانی پێوە بکرێ، ئەوەندە هەیە لە مامەڵەی قازانج بەهاوبەشدا خاوەن ماڵ لە سەرمایەو قازانج، ئەگەر قازانج هەبوو لە ئارادا، زەکات دەردەکا، بەڵام کارکەر (عامل) بەشە قازانجەکەی خۆی دەخاتە پاڵ سامانەکانی تری، جا ئەگەر سەرجەمیان گەیشتە رادەی زەکاتو ساڵ هاتەوە بەسەریدا، ئەوا بەپێی خۆی زەکاتی لێ دەدا، دەنا نا.

بۆیە دەڵێین: حسابی ئاسنگەر - حیسابی جاری - یش زەکاتی لێ دەکەوێ، چونکە قەرزێکی هیوادارە.

## زەکاتی شتە بەکرێگیراوەکانو کارگەو وێنەیان

(زكاة المستأجرات والمصانع ونحوها)

مامۆستای ئێمە دکتۆر یوسف قەرزاوی زاراوەی (المستغلات : خاوەن داهاتەکان)ی بەکارهێناوە بۆ ئەو جۆرە شتانە کە زەکات لەخۆیان ناکەوێ، ئیتر لەبەر هەر هۆیەك زەکاتیان لێ ناکەوێ ئەوە گرنگ نییە، بەڵام بۆ ئەوە راگیراون کە لەرێگەی بەکرێدانو فرۆشتنی بەرهەمیانەوە نەشونماو گەشە بکەن. (فقه الزكاة — ١/٤٥٨...)

ئەمانەیش وەك بەكرێ گیراوەكان، لەجۆری كۆشكو ساختمانو خانوو و ئاپارتمانو پاپۆرو گەمیو فرۆكەو ولاخی كرێو خشڵی كرێو قاتو پۆشاكی كرێو شتی وای تر، هەروەها وەك ئەو كارگانەی كە شت دروست دەكەن، وەك ئەو ئاژەڵە ئالیك خۆرانەیش كە شیرو ماستو خوریو مووەكەیان دەفرۆشرێ، وەك لەمانە گرنگتریش كە كێڵگەی بەخێوكردنی ئاژەڵو پەلەوەر، كە بۆ فرۆشتنە گۆشتو هێلكەكەیان پەروەردە دەكرێن.. هەروەها

جا لەم بارەیەوە لەكۆنو نوێدا، زانایانی شەرع را جیاییان هەیە، هەیانە دەفەرموون: (ئەم جۆرە كارگەو خانە بەكرێگیراوانە، لە كۆتایی گشت ساڵێكدا دەقەبڵێنرێن، وەبە وێنەی سامانی بازرگانی زەكاتیان لێ دەدرێ)، ئەمە بۆچوونی هەندێ لە حەنبەلییەكانە، وەفەرمایشتێكە لە فەرمایشتەكانی مالیكو چەند زانایەكی تریش.

هەیشیانە دەفەرموێ: داهاتەكەیان لەكاتی وەرگتنیدا زەكاتی دەدرێ، وەك زەكاتی دراو، چاوەڕوانی ساڵڕۆژ ناكرێ، ئەمەیەكێكە لە گێڕدراوەكان لە پێشەوا ئەحمەدەوە، وە فەرمایشی هەندێ لە مالیكییەكانەو هەروا گێڕدراویشەتەوە لە كۆمەڵێ لە هاوڕێیان، لەوانە ئیبنو عەبباسو ئیبنو مەسعودو موعاوییە، لە كەسانی تریشەوە گێڕاویانەتەوە، وەك عومەری كوڕی عەبدولعەزیزو حەسەنی بەصریو زوهریو مەكحولو ئەوزاعی.

هەیشیانە دەفەرموێ: ئەم داهاتانە زەكاتیان تیادا نییە، بەڵكو دەخرێنە سەر سامانەكانی تری زەكاتدەر.. جا ئەگەر گەیشتە رادەو ساڵڕۆژی هاتەوە بەسەردا ئەوا زەكاتەكەی دەدا. ئەمەیش رای زۆرینەی پەیڕەوانی رێبازەكەیە كە ناسراون بە (المذاهب الأربعة). ئەوەی رای پەسەندە لەلای من ئەمەیە: (زەكات لەكۆی دەستكەوتەكەیان دەكەوێ هەركاتێ كرێكەیان بوو بەماڵ، هەروەها لەو پارەیەش

کەلە فرۆشتنی بەرهەمەکەیان دەست دەکەوێ، بەرێژەی ٢,٥٪ چوار یەکی دەیەك واتە: چل یەك) بەڵام لەپاش لێ داشکاندنی مەسرەفی فیعلیو مەسرەفی صیانە واتە: لە پوختەی دەسکەوت بەرێژەی ٢,٥٪ زەکات دەدرێ، بەمەرجێ ئەو پوختەیە بگاتە رادە، کە بریتییە لە ٨٥گرام زێڕ لە ساڵێکدا.

هەندێکی تر لە زانایانی هاوچەرخی شەرع، وەك مامۆستایان ئەبو زوهرەو عەبدول وەهاب خەلافو عەبدولرەحمان حەسەن، ئەم زاتانە رایان وایە : (ئەوەی پێویستە لەخاوەن داهاتەکاندا دەیەکە، یا نیوەی دەیەکە، بەقیاس لەسەر زەوی کشتوکاڵ، دەیەك لە پوختەی قازانج، نیوەی دەیەك لە پێش داشکانی مەسرەفا) مامۆستا قەرزاویش رای ئەوانی بەلاوە پەسەندە، بەڵام بەمەرجێ رێژەی زیانی ساڵانە، کە لە کەرەستەو کارگەکان دەکەوێ، ئەو رێژەیەش لە پوختەی دەسکەوت دەربکرێ.

فەتوایەکیش لە کۆنگرەی زەکاتی یەکەمەوە دەرچووە، بەدەق دەڵێ: مەبەست لە خاوەن داهاتەکان (المستغلات) کارگەی بەرهەمهێنانو ئەو خانووبەرەو زەویو زارو ئوتومبیلو ئامێرو شتی تر لەم بابەتەیە، کە ئامادەن بۆ کرێدان، بەڵام بە خودی خۆیانەوە ئاڵو وێلو بازرگانی ناکرێ، جا ئەم خاوەن داهاتانە، لیژنەکە بەیەك دەنگ دەڵێن: زەکات لەخود (عین)ە کەیان ناکەوێ، بەڵکو زەکات لە دەستکەوتەکەیان دەکەوێ، چەند رایەك هەیە لەبارەی چۆنیەتی زەکاتی ئەم دەرامەتەوە، رای زۆرینە دەڵێ : (دەسکەوت دەخرێتە سەر سامانەکانی تری خاوەنەکەی، وەك پارەو سامانی بازرگانی، وەرادەو ساڵ رۆژی ئەوانی بۆ دادەنرێ، ئەوجا بەرێژەی چواریەکی دەیەك (٢,٥٪) زەکاتیان لێ دەدرێ، ئیتر ئەستۆی خاوەنیان لە مافی زەکات خاوێن دەبێ).

هەندێکیش رایان وایە: (زەکات پێویست دەبێ لە پوختەی دەسکەوتیان، بەمەرجێ زیاد بێ لە پێویستییە بنچینەییەکانی خاوەنەکەی، لەپاش لێدەرکردنی مەسرەفو

ئەو ڕێژەیەی کە بەرامبەر زیانی ساڵانەی خاوەن دەستکەوتەکان دانراوە وە لەپاش وەرگرتنی، دەسبەجێ زەکاتەکەی بەڕێژەی ١٠٪ دەدرێ، بەپێوەری زەکاتی دانەوێڵەو بەروبومی زەوی).

**تێبینی:**

بەپێی ئەو رایەی کە دەفەرموێ: زەکات لە پوختەی دەستکەوتی خاوەن دەستکەوتەکان دەکەوێ، بەشی کەمترین گوزەران چەندە، ئەوەندەی لێ لادەدرێ، ئەگەر خاوەنەکەی دەسکەوتی تری وای نەبوو کە سەروبەر بەسی بکات.

## پرۆژەکانی قوتابخانەو باخچەی منالان و شتی تری وا

ئەمانەیش لەپوختەی دەستکەوتی ساڵانەیان بەڕێژەی چوار یەکی دەیەك ٢,٥٪ زەکاتیان لێ دەکەوێت.

## زەکاتی موچەو کرێ دەست (سامانە دەسکەوت)

بێگومان موچەو کرێ دەست، ئەگەر سەروبەر بەشی پێویستیەکانی خاوەنەکانیان نەکەن زەکاتیان لێ ناکەوێ، مەگەر خەرج نەکرێن و پاشەکەوت بکرێن و پاش ساڵڕۆژی رادە بەڕێژەی ٢,٥٪ زەکاتیان لێ دەدرێ.

بەڵام خاوەنی مووچەو کارو پیشەی سەربەست، کە ئەوەندە زۆربن، لە پێویستییەکان زیاتر بن، ئەوە لەسەر ئەم دوو جۆرەن:

**جۆری یەکەم:** سامانی خۆی چاودێری دەکا، دەستبڵاو نییە ماڵ بەفیڕۆ نادا، لەبەرئەوە لە مووچەو کرێ و دەستکەوتەکەی، ڕێژەیەك پاشەکەوت دەکات، کە بگاتە رادە، کە (٨٥ گرام) زێڕە ئەم جۆرە کەسە پێویستە زەکاتەکەی لەگەڵ سامانەکانی تریدا بدات.

**جۆری دووەم:** مووچەو بەراتێکی باشی هەیە، کرێـیـەکی مـشـەی دەسـت دەکـەوێ، بەڵام دەست بڵاوە، بەراستو بە چەپدا ماڵ داغـان دەکـات، هـەر ئەوەنـدە دەزانـی کەرەسـتـەی نـاو ماڵەکـەی دەگـۆڕێ، خۆشـرۆکەی کـۆنو نۆدەکـا، سـەر دەکاتـە دەعوەتو دەعوەتکاریو زیادە مەسرەف.

ئـەم جـۆرە کەسـانە زانـاو هاوچـەرخەکان رای جیایـان هەیـە لەبارەیـەوە، هەیانـە دەفەرموون (زەکات پێویست دەبێ لە زیاد لە پێویستی خۆی).

بۆنموونە: گریمان زید مووچەی مانگانەی دەهەزار ریاڵـە، خـۆیو خێزانەکـەی پێـنج هەزار ریاڵ بەشیان دەکات بە رێكوپێکی، کەچی زید هەموو مانگێ مانگانەکـەی داغان دەکات، هیچی لێ پاشەکەوت ناکـات، ئـەوە هـەموو مـانگـێ پێـنج هـەزار ریاڵی لەسەر کەڵەکە دەبێ، جا هەرکاتێ ساڵیان بەسـەردا هاتـەوە دەبـێ زەکـاتی هەمووی بدا، واتە: دەستکەوتی ساڵانەی دەکاتە ١٢×٥٠٠٠ = ٦٠,٠٠٠ شەسـت هەزار ریاڵ، ئەوسا زەکاتی ئەم برە پارەیە بەرێژەی ٢,٥٪ دەدا، کەدەکاتـە ١٥٠٠ هەزارو پێنج سەد ریاڵ لە ساڵێکدا، جا یا لەکۆتایی ساڵدا ئەم چەردە پارەیە دەدا، یا هەموو مانگێ سەدو بیستو پێنج ریاڵ زەکات دەدا.

هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان دەفەرموون: ئەم جۆرە کەسە کاتێ هـیچ پاشـەکەوت نەکا زەکاتی لەسەر نییە، بەڵام رای یەکەم دوور بینترەو میانەترە.

## لە کۆنگرەی یەکەمی زەکاتەوە فەتوایەك دەرچووە بەدەق دەڵێ:

١- ئەم جۆرە سامانە دادەنرێ بە دەسکەوتی هەوڵو رەنجی مرۆڤ، کە توانای خـۆی لە کارێکی بەسوددا دەخاتە گەڕ، کە بریتییە لەم جۆرە شتانە: وەك کرێی کرێکارو مووچەی فەرمانبەرو دەرامەتی پزیشكو ئەندازیارو ئەمانە، هەروەها دەسـتکەوتی هەموو جۆرە کاسبیەکی ترو خەڵاتو پاداشتو شتی تـر لـەم بابەتـە، کـە ئەمانـە هەموویان لەشتی خاوەن دەستکەوتی دیـاری پەیـدا نـابن، ئـەم جـۆرە دەسـتکەوتە

زۆربەی ئەندامەکانی لیژنەکە بۆ ئەوە چوون: کە لەکاتی وەرگرتنیدا زەکاتی تیادا نییە بەڵام ئەو کەسەی کە بەدەستی هێناوە دەیخاتە سەر سامانە زەکات ئامێزەکانی تری، لەرادەو ساڵ رۆژدا، هەرکاتێ گەیشتە رادەی زەکاتو ساڵڕۆژی هاتەوە زەکاتی هەمووی دەدا، بەڵام هەر دەسکەوتێ لەمانە لەناو ئەو ساڵەدا دەستی بکەوێ، لە کۆتایی ساڵدا زەکاتی ئەویش دەدا، با ساڵی تەواویش بەسەر ئەم دەستکەوتە تازەیەدا نەهاتبێتەوە، کە لەپاش پەیدابوونی رادە دەستی کەوتووە، ئەگەر دنیابوو خاوەنی ئەم جۆرە دەستکەوتە سامانی تری نەبوو، ئەوە سەرەتای ساڵڕۆژی لەو کاتەوە دەست پێ دەکا کە دەسکەوتەکەی خۆی بگاتە رادە، ئیتر لەو رۆژەوە لەپاش هاتنی ساڵڕۆژ بەرێژەی ٢,٥٪ زەکاتی تیا پێویست دەبێ، بەمەرجێ پوختەی وەرگیراوی بگاتە رادەو لە پێویستی خۆی پتر بێو مافی قەرزی پێوە نەبێ. جا هەرکاتێ ئەم ئەندازەیەی دا بەزەکات، ئیتر پێویست نییە لەسەری کە دووبارە زەکاتی لێ بداتەوە، لەوکاتەدا کە ساڵڕۆژی سامانەکانی تری تەواو دەبێو زەکاتیان دەدا.

لەهەمان کاتدا دروستە بۆ زەکاتدەر کە حیسابی سەری لەم بارەیەوە رابگرێو لەوەدوا لەگەڵ سامانە ساڵ ئامێزەکانی تریدا زەکاتی بدا. ئەم رایە لەبارترە، بەڵام لە موغنی ئیبنوقودامەدا دەفەرموێ: لە ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباسو موعاویە دەگێڕنەوە: کە زەکات لەو دەمەدا لەم جۆرە سامانەدا پێویست دەبێ کە دەبێ بە ماڵی خاوەنی، پێشەوا ئەحمەدیش لە چەند کەسێکەوە راگوێز دەکات: ئەو دەمەیە زەکاتی دەدا کە وەری دەگرێو دەبی بە ماڵی.

## زەکاتی دەسەنەو بەخششی دراوی

(زكاة العطاءات والهبات النقدية)

هەر کاتێ کەسێ سامانێکی لە دەوڵەت، یا لە شتێ تر دەسکەوت لە ڕێگەی دەسەنەو خەڵاتو بەخشیشو پاداشتو بەخشینەوە ئەوە هەندێ لە هاوڕێیانو پەیڕەوانو شوێنکەوتوان دەفەرموون: (پێویستە دەسبەجێ زەکاتی بدا) جارێ لە ئیبنو عەبباس پرسیار کرا: ئەگەر کەسێ لەلاوە سامانێکی دەست بکەوێ چۆن زەکاتەکەی بدا؟ فەرمووی: (ئەو ڕۆژەی کە دەستی دەکەوێ زەکاتەکەی دەدا).

شتی وا لە ئیبنو مەسعودو موعاویەشەوە دەگێڕنەوە، ئەبو عوبەیدە باس دەکا: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز جێنشینی ڕاشدی پێنجەم، کاتێ موچەو بەراتی بە پیاوێ لەسەر کارەکانی خۆی دەدا، زەکاتەکەی لێ وەرگرت، وەهەرکاتێ ماڵی زەوتکراوی بۆ خاوەنی وەردەگرتەوە زەکاتەکەی لێ وەردەگرت، هەروەها زەکاتی لەدەسەنەو خەڵاتو بەخشیش وەردەگرت، لەوکاتەدا کەدەدرانە دەست خاوەنیان، لەزوهریو حەسەنی بەصریو مەکحوولو ئەوزاعی ئەم فەرمایشتە دەگێڕنەوە، ئەم ڕایە ظاهرییەکان سەرپەرشتی دەکەن، وە ئیبنو حەزمی ظاهری بەرگریەکی گەرمی لێ دەکا، لەهەمان کاتدا چەند گێڕانەوەیەك لە ئەحمەدەوە هەیە، ئەم ڕایە یەکێکیانە.

جەماوەری شەرع زانەکان لەسەر ئەوەن: کە دەستبەجێ زەکاتی تێدا نییە، بەڵام زەکاتدەر دەیخاتە پاڵ سامانە زەکات نامێزەکانی تری، هەرکاتێ گەیشتنە رادە لە ساڵڕۆژیدا زەکاتەکەی دەدا، ڕای پێشین لەبارترو دووربینترە.

## زەكاتی پاداشتی كۆتایی خزمەت بەهەردوو جۆرەكەیەوە

## زەكاتی مووچەی خانەنشینی

سەبارەت بەم بابەتەیش فەتوایەك دەرچووە، لە كۆڕی پێنجەمەوە سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەكانی زەكات، دەڵێ:

١- پاداشتی كۆتایی خزمەت بریتییە لە بڕی پارەی بڕیاردراو، كە بۆ كرێكار مسۆگەر دەبێ، لەسەر خاوەن كارەكەی، لە كۆتایی خزمەتەكەیدا، بەپێی خوازە (مقتضى)ی یاساو سیستمە یاساییەكان، كە لە هەلومەرجی وادا ڕەچاو دەكرێن، هەركاتێ مەرجە دیاریكراوەكانی هاتنە دی.

٢- پاداشتی كۆتایی خزمەتی فەرمانبەرو كرێكارو ئەمانە، كە بریتییە لە بڕی سامانی بڕیاردراو، دەوڵەت یا دامەزراوە تایبەتییەكان دەیدەن بەو كارمەندو كرێكارانە كەبەر یاسای دەستەبەری كۆمەڵایەتی دەكەون، بەڵام مەرجی پێویست بۆ مسۆگەركردنی مووچەی خانە نشینییان تێیدا نەبێ.

٣- مووچەی خانە نشینی بڕی سامانی مانگانەیە كە فەرمانبەر یا كاركەرو كارمەند مسۆگەری دەكاو دەبێ بەماڵ لەسەر دەوڵەت، یا لەسەر دامەزراوە تایبەتییەكان، لەپاش تەواوبوونی خزمەتەكەی بەپێی یاساو نەریتە ڕێكخەرەكان (القوانين والأنظمة) هەركاتێ مەرجە پێویستیەكان هاتنەدی.

٤- زەكات لەسەر كارمەندو كرێكارو فەرمانبەر نییە لەم مافە سامانییە مسۆگەر كراوەیاندا، بەدرێژایی كاتی خزمەتەكەیان، چونكە موڵكایەتی تەواو كە مەرجە بۆ پێویست بوونی زەكات لەم جۆرە مافانەدا، نەهاتۆتە دی.

٥- ئەم مافە مسۆگەرانە هەركاتێ بڕیار دەرچوو بۆ سنوردانان بۆ ئەندازەیانو بۆ دانیان بە فەرمانبەر یا كرێكار، بەیەكجار، یاناوبەناو لەسەر شێوەیەكی خولەكی ئەوە موڵكایەتییەكەیان تەواوە، لەبەرئەوە دەبێ زەكاتی ئەو ئەندازەیە بدا كە

وەری دەگرێ، دەق وەك سامانی موستەفاد (سامانی دەستكەوت) كە لەپێشەوە باسی ئەوە كرا كە كۆنگرەی یەكەمی زەكات بڕیاری داوە كە زەكاتی سامانی دەستكەوت ئاوا دەدرێ: (ماڵی موستەفاد دەخرێتە سەر سامانەكانی تری زەكاتدەر، لەلایەنی رادەو ساڵو رۆژەوە).

٦- بەڵام راهاتنی شەرعی لەگەڵ سامانی پاداشتی كۆتایی خزمەتداو لەگەڵ مووچەی خانەنشینیدا كە لە بودجەی كۆمپانیاكاندان، پێش ئەوە كە بڕیاری سەرف كردنیان بۆ خاوەنیان دەربچێ، ئایا ئەوانە قەرزن لەسەر كۆمپانیاكە یان نا؟ وە ئەم بارودۆخە چی كاریگەریەكی لە زەكاتی سامانی كۆمپانیاكەدا هەیە؟ بۆ راهاتن لەگەڵ ئەم بابەتانەدا بڕیاری كۆتایی دواخرا بۆ دواتر، بەنیازی لێكۆڵینەوەی زیاتر، بە هاریكاری لەگەڵ دەستەی ژمێریاری بۆ پرسو راكردن بە بانكو رێكخراوە داراییە ئیسلامییەكان، بەهۆی لیژنە شەرعیەكەیانەوە.

## زەكاتی بەخشیشی ماڵ دامەزراندن

(زكاة منحة التأسيس)

واباوە كە دەوڵەت یا كۆمپانیاكان بڕێ پارە دەدەن بە فەرمانبەری تازە، بۆ ناو ماڵ رێكخستنو بناغە دانانی كەرەستەو كەلوپەلی ناوماڵ، ئەگەر فەرمانبەرەكە یان كارمەندەكە هەتا چوار ساڵ لە كارەكەیدا مایەوە ئەوا گشت ساڵێ چواریەكی ئەو برە پارەیەی لەكۆڵ دەكەوێ بەرێژەی ٢٥٪ جا ئایا ئەم جۆرە دەستكەوتە زەكاتی لێ دەكەوێ یان نا؟ لە وەڵامدا دەڵێین (ئەم برە پارەیە ئەگەر خەرج كرا بۆ دامەزراندنی ماڵ زەكاتی لێ ناكەوێ، بەڵام ئەگەر بۆئەوە خەرج نەكراو پاشەكەوتی كرد، ئەوە لە ساڵی یەكەمدا لە چارەكێكی زەكات دەكەوێ، لە ساڵی دووەمدا لە نیوە، لە سێیەمدا لە سێ بەش لە چواربەشی، لە ساڵی چوارەمدا لە هەمووی...).

## زەكاتی ماڵو سامانی قازانج بەشەریكی

ئەگەر ماڵو سامانی قازانج بەشەریكی بفرۆشرێتو قازانج دیارو ئاشكرا بێت، ئەوە زەكات لە قازانجو سەرمایەكە دەدرێت پێكەوە، بەلاّم خاوەن پارەكە تەنها زەكاتی سەرمایەو بەشە قازانجی خۆی دەدات، ئەو كەسەش كاسبی بە پارەكەوە دەكات لەبەشی قازانجی خۆی زەكات دەدات برە پارەكەی هەرچەند بێت واتە ئەگەر نەگەیشتبێتە زەكاتیش لەسەر فتوای ئەو زانایانەی باسی كاریگەری تێكەڵكردنی ماڵ دەكەن، لەسەر بۆچونی زانایانی دیكە ئەو برە پارەیە دەخاتە سەر پارەو سامانی تر ئەگەر هەیبوو، بەهەموویەوە گەیشتە بری (٢٠) مسقاڵ ئاڵتون بەرێژەی ٢,٥٪ زەكاتی دەدات، بەلاّم ئەگەر كاری قازانج بە شەریكیەكەیان بەردەوام بوو ئەوە لە كۆتایی ئەم ساڵو زەكاتداندا ئەو كاڵاو شمەكانەی هەیانە دەیخەملێنن بەپارە، پاشان هەرچیان هەبوو زەكاتی دەدەن .

- زەكاتی كارگەكان (پرۆژە پیشەسازیەكان) : ئەگەر كەسێك كارگەیەكی بەرهەمهێنی هەبوو دەبێت زەكاتی بدات، بەلاّم ئایا چۆن زەكاتی بدات ؟ بۆ ئەمە دوو بۆچوون هەیە، یان دوو رێگا هەیە :

رێگای یەكەم : دوای جیاكردنەوەی كرێی تێچوونو هەرمەسرەفێكی دیكەی لەقازانجی سافی بەرێژەی لە ١٠٪ زەكاتی لێبدات ئەمە بەقیاس لەسەر بەرهەمە كشتوكاڵیەكان، ئەمە وەكو وتمان ئەگەر تێكرای خەرجیو مەسروفاتی لێدەركرد، بەلاّم ئەگەر خەرجیو مەسروفاتی جیا نەكردەوە ئەوكاتە بەرێژەی ٥٪ زەكات بدات لەكۆی داهاتو قازانج .

رێگای دووەم : كارگەكەی وەك ماڵو سامانی بازرگانی سەیر بكاتو بیخەملێنێت بەپارەیەك پاشان لەو پارەیە لە ٢,٥٪ زەكاتی بدات، بەلاّم بۆچونی یەكەم

پەسەندترە لە فەتوای نەدوەی یەکەمدا لە ١٦ رەبیعی یەکەم باسی بابەتی زەکاتی سەردەم : لە قاهیرە لە ساڵی ١٤٠٩ ك بەم شێوەیە هاتووە .
پرۆژە پیشەسازییەکان: دوای ئاگاداربوون لەسەر ئەوەی لەم بارەیەوە هاتووە لە (فەتوای کۆنگرەی زەکاتی یەکەم) بڕگەی شەشەم بۆمان دەرکەوت کارگەو پرۆژە پیشەسازییەکان دەتوانین قیاسی بکەینە سەر زەوی کشتوکاڵی بەو حوکمەی هەردووکیان شتێکی جێگیرنو بەکارتێداکردنو خەرجکردن لە پێناویاندا دێنە بەرهەم بەم هۆیەشەوە رێژەی زەکات تێیاندا لە ٥٪ هەروەك دەکرێت شتە ئاڵوگۆڕپێکراوەکانی (**الأصول المتداولة**) وەك سەرمایەی بازرگانی سەیر بکرێتو لەسەرمایەو قازانج بەرێژی لە ٢,٥٪ زەکاتی بدرێت بەمەرجێك شتە جێگیرەکان (**الأصول الثابتة**) نەکەوێتە بەرماڵی زەکات، ئەم بابەتە پێویستی بەوردبونەوەو لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە لە نەدوەی داهاتوودا **ان شاء الله** .
لەفەتوای دەستەی باڵای شەرعیەوە بۆ ماڵی زەکاتدا هاتووە (دانیشتنی ٨٨) بەم شێوەیە: (بنەمای زەکات لە سامانی پیشەسازیدا هەمان بنەمای زەکاتە لە سامانی بازرگانیدا، لەهەردووکیاندا کاڵاو شمەکی کڕاو بەنیازی فرۆشتنەوە دەخەملێنرێت بەنرخی بازاڕو، باقی پارەو سامانی دیکەی کەسی زەکات دەری لەگەڵ کۆدەکرێتەوە، لەگەڵ هەر قەرزێك کە ئومێدی دانەوەی هەیە کە لەلای خەڵکە، پاشان ئەگەر قەرزی لەسەربوو لێی دەردەکرێت، دواتر زەکاتەکەی دەدات)، تەنها جیاوازییەکە لەوەدایە لە جێبەجێکردنی ئەم یاسایەدا کۆگا بازرگانیەکان زەکاتیان دەدرێت لەسەر بنەمای خەملاندن بۆکاڵاو شمەکەکانیان بەنرخی فرۆشتن بەمایەو قازانجەوە، بەڵام پیشەساز زەکاتەکەی تەنها لەقازانجدا دەبێت نەك لەسەرمایەدا، چونکە سەرمایە دەبێتە ئامێرو کەرەسەی جێگیر (**الأصول الثابتة**) ئەوانەش زەکاتیان لێ نادرێت، بەنموونە : ئامێرەکان، سەیارەو

کەرەسەکان، خانوو باڵەخانە تایبەتەکان بەکاری کارگە، ئەمانە بەهۆکارو کەرەسەی بەرهەمهێنان هەژمار دەکرێن، بەمانایەکی دیکە ئەمانە لەبەر ئەوەی شتی بەرهەمهێنن زەکاتیان لێنادرێن . بەڵام کەرەستەی خاو کە بەکاربهێنرێت لەکارگەدا ساڵی بەسەردا بێتەوە، دەبێت بدرێتە پاڵ پارەو سامانی کارگەکە وەك کاڵاو شمەکی بازرگانی دەبێت زەکاتی بدرێت، ئایا لە مەخزەندا بێت، یان بەکارهێنرابێت بۆ دروستکردنی شت بەڵام نەفرۆشراو بێت تاکاتی دانی زەکاتەکەی بەنرخی کەرەسەی خاو حساب دەکرێتو زەکاتی دەدرێت، ئەو برە لە نرخی زیادە حساب ناکرێت کە بەهۆی دروستکردنەوە چووەتەسەری .

## زەکاتی سامانی بەخشراو

ئەگەر کەسێك سامانێکی دەست کەوت لە رێگای بەخشین بێت یان هاوکاری لەلایەن دەسەڵاتەوە یان هەرکەسێکی تر، ئەوە هەندێك لە هاوەڵانو شوێن کەوتوان، دەفەرموون : واجبە یەکسەر زەکاتی ئەو برە سامانە بدرێت، پرسیار لە (عبدالله ی کوڕی عباس) کرا، کە ئەگەر کەسێك سودمەند بوو لەسامانێك، چۆن زەکاتەکە بدات، فەرمووی لەو رۆژەی سودمەند بوو زەکاتەکەی دەدات.

هەروەها لە (عبدالله ی کوڕی مسعود) و (معاویە) وە هەمان بۆچوون گێڕاوەتەوە، (أبوعبید) باس دەکات کە خەلیفەی پێنجەم (عمر کوڕی عبدالعزیز) کاتێك کرێی کەسێکی دەدا لەسەر کارەکەی زەکاتەکەی لێ وەردەگرت، وە مافی هەر ستەم لێکراوێکی بگێرایەوە کەسامانی هەبوایە زەکاتەکەی لێوەردەگرت، هەروەها زەکاتی لەبەخششی کەسێك وەردەگرت کە پێی بدرایە .

ئەم قسەیەش لە (الزهری) و (المس) و (مكحول) و (ئەوزاعی) ریوایەت كراوە، هاوكات (ظاهریە) كان كاریان پێكردووە، وە (أبن حزم) زۆر بەرگری لێ دەكات‌و هاوكات ئەم بۆچوونە لە (أمام أحمد) یش ریوایەت كراوە .

- بەلاّم كۆی زانایان لەسەر ئەوەن پێویست نیە یەكسەرو كتوپڕ زەكاتی لێ بدرێت، بەڵكو ئەو پارەش لەگەڵ باقی سامانەكەی یەك دەخات‌و كاتێك گەیشتە ئەندازەی بەلاّم رای یەكەم زیاتر جێگای متمانەیە .

سەبارەت بە بابەتە هەنوكەیەكان‌و هاوچەرخەكان كۆڕبەندی پێنجەم فەتوای داوە، كە:

١- پارەیەك كە دەدرێت بە خاوەن كار دوای تەواوكردنی ئەركی خۆی پێی دەدرێت بە پێی یاساو رێكخراوێك كە چەند مەرجێكی سنورداری تێدایە .

٢- خەلاّتی خانەنشینی كەدەوڵەت یان دەزگاكان تایبەتی دەكەن بەكارمەندو كرێكارەكانیان‌و ئەندازەكەی بڕاوەیە بەیاسای بیمەی كۆمەلاّیەتی ئەگەر هەموو مەرجەكانی داواكراوی تێدا نەبوو بۆ (معاشی) خانەنشینی .

٣- (معاشی) خانەنشینی ئەندازەیەك پارەیە مانگانە دەدرێت، بەكارمەند یان كرێكار كەدەوڵەت یان دەزگای تایبەتمەند دەیدات دوای تەواوبونی ماوەی خزمەت كردنی بەپێی یاساو رێكخراوەیەك، ئەگەر مەرجە دیاری كراوەكانی تێدا هاتەدی .

٤- كرێكار یان كارمەند لەم مافانەی خۆی كەپێی دەدرێت بە درێژای ماوەی خزمەتەكەی زەكاتی لەسەر نیە چونكە ئەو بۆتە خاوەنی سامانێك كەمەرجەكانی واجب بوونی زەكاتی تێدابێت .

٥- ئەگەر ئەو پارانەی باسمان كرد بەبڕیار ئەندازەكەی‌و پێدانی بەكارمەند یان كرێكارەكەی ئەنجام درا، بەیەك جار یان بەچەند ماوەیەك، ئەوا ئەو كەسە دەبێتە خاوەنی وە زەكاتیشی دەدات لەوەی دەستی دەكەوێت، ئەمەش لە(كۆنگرەی

یەکەمی زەکات) باسی لیّ کراوە کەخاوەنەکەی زەکاتەکەی دەدات بەپێی مەرجی ئەندازەو ساڵ بەسەرا سوڕان .

٦- بەڵام چۆنیەتی لایەنی شەرعی بۆ سامانێك کەبەخشیشە لە کۆتایی خزمەت وە (معاش) خانەنشینی لە میزانی شەریکات (کۆمپانیا -کارگە) پێش دەرچوونی بڕیاری خەرجکردنی، ئایا قەرزەکە لەئەستۆی (شەریکە) یان نا ؟ وە ئایا کاریگەری لەسەر زەکاتی سامانی شەریکە هەیە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر بە دواداچوون بەهاوکاری لەگەڵ دەزگای ژمێریاریو خەرجی دەزگا داراییەکان لەڕێگای لیژنە شەرعییەکانیانەوە .

## زەکاتی ماڵەکەت.. بنەماکانی ژمێریاری

### بەشی یەکەم

کۆمەڵێك یاساو بابەتی ژمێریاری هەیە بەکورتی هەندێکیان باس دەکەین بە دەستکارییەوە لە ڕێنماییو بەڵگەی ژمێریاری زەکاتی کارگەکان، ئەمەش ئامادەکراوە لەلایەن لیژنەیەکەوە لە شارەزایانی شەرع و ژمێریارانەوە، بەم شێوەیە:

ئەسل لەهاتنەوەی ساڵ بەسەر ماڵ و ساماندا ڕەچاوکردنی ساڵی کۆچی مانگی یە، بەڵام هیچ ڕێگرییەکی شەرعی نییە کەساڵی زاینی ڕۆژ حساب بکرێت بەمەرجێك ئەو چەند ڕۆژە زیادەیەی هەیەتی بەسەر ساڵی کۆچیدا لەبەرچاو بگیرێت، ئەوکاتە لەبری ڕێژەی لە ٢،٥٪ دەبێتە ڕێژەی ٢،٥٧٧.%

دەگونجێت چارەسەری کەمی ساڵەکە لەڕێگەی حسابکردنی ساڵی دووەمەوە بێت، بەنمونە ئەگەر کارگەکە لەناوەڕاستی ساڵدا دەست بەکارکردن بکات و نەتوانرێت لەساڵی یەکەمدا میزانیەی بۆ ڕێك بخرێت، لەساڵی دووەمدا ڕەچاوی ئەو شەش مانگە بکرێت لەمیزانیەدا بۆ (١٨) مانگەکە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی زیادەی

ڕۆژەکانی ساڵی زاینی بەسەر ساڵی کۆچیدا ژمارەی ڕۆژەکان دەبێتە (٥٤٨) ڕۆژو لەسەر ئەو بنەمایە زەکات دەدرێت.

بوونی کەرەستەو ئامێری جێگیر (شتی بەکارهێنراو) وەك: زەوی کشتوکاڵی، خانوو، باڵەخانە، ئامێر، سەیارە، ئەساس و پێویستی بەردەست، ئەمانە زەکاتیان تێدا نییە.

ئەو شتانەی بەکاردەهێنرێن بۆئەوەی پارە پەیدا بکەن، وەك: هەرشتێك دەدرێتە کرێ، لەباڵەخانەو شوقەو خانوو، یان سەیارەو هەرشتێکی دیکە مەبەست لێیان بەکرێ دانە، یان دەفرۆشرێن لەکاتی گونجاو پێویستدا، ئەم شتانە زەکاتیان تێدا نییە لەخودی خۆیاندا واتە نرخەکەیان نابێتە ماڵی زەکات، بەڵام کرێ و داهاتەکەیان دەبێتە ماڵی زەکات و لەگەڵ ماڵی تردا زەکاتیان دەدرێت، ئەگەریش فرۆشران ئەوە نرخەکەیان دەبێتە ماڵی زەکات.

ئەو شتانەی جێگیرن و لەبواری وەبەرهێنانی درێژخایەندا کڕاون یان دروستکراون بەمەبەستی بازرگانی وەك: خانوو یان شوقە بەنیسبەت کۆمپانیا وەبەرهێنەکانەوە، ئەمانە دەبێت بەنرخی بازاڕ بخەملێنرێن و بەماڵی زەکات دابنرێن و زەکاتیان بدرێت.

پڕۆژەی وەبەرهێنی درێژخایەن لەبواری جێبەجێکردندا وەك: پڕۆژەی بیناسازی و خانوو باڵەخانە بەمەبەستی فرۆشتنی بەخەڵك لەدوای تەواوبوونی، پێویستە بەنرخی ڕۆژ و بازاڕ بخەملێنرێت لەکۆتایی ساڵدا، بەپێی نرخی زەوی و بیناکەی، یان بەپێی نرخی کەرەسەی بەکارهێنراو بۆ ئەو خانوانەی تەواو نەکراون، پاشان زەکاتەکەیان بدرێت.

دانانی پارە بەبڕی دیاریکراو بەمەبەستی چاککردنەوە و نۆژەنکردنەوەی ئامێر و کەرەسە جێگیرە جۆراوجۆرەکان، ئەم بڕە پارەیە زۆرجار بڕێکە بەئاستی دابەزینی

نرخی ئەو ئامێرانە بەهۆی بەکاربردنەوە کە روو لەکەمی نرخ دەکەن. ئەم بڕە پارەیە دەبێت زەکاتی لێ بدرێت و بدرێتە پال ماڵ و سامانی زەکات، بەهەمان شێوە ئەو بڕەش کەبۆ رەچاوکردنی دابەزینی نرخ دادەنرێت.

بەهەمان شێوە قازانجیش دەخرێتەوە سەر ماڵەکە و پێکەوە زەکاتیان دەدرێت، زەرەریش لەبنەڕەتدا ناچێتە ناو خەملاندن.

سوودی ریباو وەرگرتنی یان دانی بەرپرسانی کۆمپانیا پێی گوناهبار دەبن، ئەگەر زیادەیەکی ریبا هەبوو دەبێت خۆیانی لێ رزگار بکەن و تێکەڵ نەکرێت بەماڵی زەکات.

هەموو جۆرە ئیحتیاتەکان لەقازانجی ئیحتیات، یان ناچاری بەپێی یاسا، یان ئارەزوومەندی، یان ئیحتیاتی سەرمایە ئەمانە هەموویان دەبێت لەگەل ماڵی زەکاتدا کۆبکرێنەوە و زەکاتیان بدرێت. بڕی دیاریکراو بۆ ئەگەری دابەزینی نرخ یان پرۆژەی درێژخایەن بەماڵی زەکات دانانرێت و زەکاتی لێ نادرێت.

هەر پرۆژەیەکی دروستکردن ئەوە بخوازێت کەرەسەی خاوی بۆ زیاد بکرێت ئەوە زەکاتی لێ دەدرێت بەپێی نرخی بازار بەبێ گوێدانە نرخی تێچوون. بەڵام ئەو پرۆژانەی کەرەسەی خاویان تێناچێت وەك هەڵکەندنی چاڵ، یان روخاندن و لابردن ئەمانە شتانێك نین بخەملێنرێن، بەڵکو سەیری ئەو بڕە پایە دەکەین کەوەردەگیرێت لەبەرامبەریدا، بەڵام ئەو زەویەی ئامادەکراوە بۆ فرۆشتن زەکاتی لێ دەدرێت ئەگەر بۆ فرۆشتن کردرابێت پاش ئەوەی خانووی لەسەر کرا.

ئەو کەرەسەو شتانەی لەبەکارهێناندا دەمێننەوە لەدروستکردندا بەنرخی بازار زەکاتیان دەدرێت، ئەو کەرەسانەی رۆڵێك دەبینن و لەبەکارهێناندا نامێنن وەك ئەو شتانەی بۆ پاککردنەوە بەکاردێن یان سوتەمەنی ئەمانە لەماڵی زەکات

حساب ناکرێن، چونکە بۆکاری بازرگانی و فرۆشتن نەکرداون بەڵکو هۆکارن بۆ تەواوکاری پرۆژەکان.

ویژدان دەزگای چاودێری مرۆڤە، ئەگەر باش و چاك بوو، ئەوا ئەو مرۆڤە رەفتار و سلوکی باش دەبێت و، ژیانیش روو لەباشی و چاکی دەبێت، ئەگەریش خراپ و ناپاك بوو، ئەوە رەفتار و سلوکیش خراپ دەکات، ئەوکاتە ژیانیش خراپ دەبێت شیرازەی دەپچرێت.

ئیدی کێشەکە لێرەدایە خەڵکانێك دەیانەوێت شتە جیاواز و دژ بە یەکەکان کۆبکەنەوە، دەبینین لەگەڵ نوێژخوێنەکاندا نوێژ دەکەن، لەگەڵ رۆژووگراندا رۆژوو دەگرن، حەج دەکەن و زەکات دەدەن، بەڵام لەلایەکی دیکەوە هەر هەلێکی خراپیان بۆ دەست بدات بەسەریدا ناچن و خۆیان لەحەرام و سنور شکێنی خودا ناپارێزن، ئەمانە ویژدانیان مردووەو، ئەخلاقیان تێکچووە و سلوکیان خراپ بووە، بۆیە ئەمانە خراپترینی خەلقی خودان، چونکە خەڵك چاوەڕێی خێروچاکەیە لێیان، بەڵام ئەوان لە تاواندا رۆچوون.

**بەشی دووەم**

پارچەی زیادەی ئامێرەكانی بەرهەمهێنان شتی بەكارهێنان، بۆ مەبەستی بازرگانی كردن نییە بۆیە زەكاتیان لێ نادرێت. كاڵاو شمەكێك كە لەرێگادا بێت، كۆمپانیا یان بازرگان پارەكەی داوە بەڵام هێشتا نەگەیشتووەتە دەستی، ئەوەی بەلامانەوە پەسەندە بەنرخی كرینە كەدەخەملێنرێت ئەگەر پارە درابوو، ئەگەر پارەكە نەدرابوو ئەوە لەپارەكە زەكات دەدرێت.

قەرزی كۆمپانیا یان كەسی بازرگان لە لێواری فەوتاندا بێت و وەرگرتنەوەی جێگەی گومان بێت لەماڵی زەكات حساب ناكرێت، بەڵكو هەركات گەڕایەوە تەنها زەكاتی یەك ساڵ دەدات ئەگەر چەندین ساڵیشی پێ بچێت.

تەئميناتی پارە كە گلدەدرێتەوە بۆ پێدانی بەڵێننامەی جێبەجێ كردن یان بەهەر رێگایەكی دیكەی یاسایی دەكرێتە بارمتە لەپێناوی كاروباری كۆمپانیاكەدا بەماڵی زەكات حساب ناكرێت، بەڵكو هەركات گەڕێنرایەوە تەنها زەكاتی یەك ساڵی لێدەدات ئەگەر چەندین ساڵیشی پێ بچێت، چونكە خاوەندارێتیەكەی ناتەواو دەبێت لەسەر ئەو برە پارەیە.

ئەو داهاتەی تایبەتی ئەو ساڵەیە كەكاتی زەكات دانیەتی با وەریش نەگیرابێت، دەبێتە ماڵی زەكات و دەبێت زەكاتەكەی بدرێت.

ئەوەی بە ئەمانەت دانراوەو ئەوەش لەحسابی جاری بانكدایە بەماڵی زەكات دادەنرێت و دەبێت زەكاتەكەی بدرێت.

ئەو داخوازییانەی لەسەر كۆمپانیایە بۆ دانی پارە یان بووەتە قەرز لەسەری لەماڵی زەكات جیادەكرێتەوەو برەكەی بەر زەكات ناكەوێت.

خەرجی و سەرفیاتی کۆمپانیا لەماڵی زەکات جیادەکرێتەوەو بەر زەکات دان ناکەوێت، بەومەرجەی کاتی خەرجکردنیان هاتبێت.

داهات و قازانجی وەرگیراو بەشێوەی پێشەکی یان پێش وەخت بەماڵی زەکات دادەنرێت و دەبێت زەکاتیان بدرێت.

ئەو باجانەی کەوتووەتە سەر کۆمپانیاو کاتی دانیان هاتووە لەماڵی زەکات جیادەکرێنەوە، ئەو برە قازانجەی پێشنیار کراوە بۆ دابەشکردن جیا ناکرێتەوە لەماڵی زەکات (بەڵکو دەبێت زەکاتەکەی بدات) با بریاری دابەشکردنی درابێت، چونکە کەوتووەتە کۆتایی ساڵی زەکاتەوە، خاوەن پشکەکان لەساڵی نوێدا وەریدەگرن. ئەو تەئمیناتەی هاوڵاتیان دەیدەنە کۆمپانیاکان لەماڵی زەکات جیادەکرێتەوە، چونکە دەبێتە قەرز لەسەر کۆمپانیاکان.

بڕی دیاریکراو لەبری مۆڵەت بەپێی یاسا لەماڵی زەکات جیادەکرێتەوە ئەوەی لەکاتی خانەنشینکردندا دەدرێتە فەرمانبەران لەماڵی زەکات جیادەکرێتەوە، ئەو قازانجەی راگیراوەو دابەش ناکرێت و، ئەو قازانجەش پارێزراوە لەماڵی زەکات جیا ناکرێتەوەو دەبێت زەکاتەکەی بدرێت.

هەموو خەرجیە حەقیقیەکان لەماڵی زەکات جیا دەکرێتەوە.

## چەند بابەتێکی گرنگ سەبارەت بەزەکات

**١- ماڵی دەوڵەت وەقف و رێکخراوە خێرخوازەکان زەکاتیان لێ ناکەوێ،** چونکە ئەم ماڵانە تەرخان کراون بۆ دڵنەوایی گەل بۆ بەرژەوەندی نەتەوە، وەکی تریش لە راستیدا ئەم جۆرە سامانە ماڵی کەسێکی تایبەت نین.

**٢- زانایانی شەرع سامانی زەکات لەخۆگر دابەش دەکەن بەدوو بەشەوە: دارایی دیارو دارایی نادیار.** لە فەتواکانی کۆڕی پێنجەمدا، سەبارەت بە بابەتە هاوچەرخەکانی زەکات ئەمەی دواوە هاتووە:

أ- زانایانی شەرع بەیەك دەنگ، بەبێ را جیایی دەڵێن: سامانی زەکات ئامێز، دابەش دەکرێ بەدوو بەشەوە: دارایی دیارو دارایی نادیار، وە لەسەر ئەم دابەش کردنە چەندین بڕیاری شەرعی جیاجیا دروست دەبێت.

ب- دارایی دیار (أموال الظاهرة) کاربەدەستی وڵات بۆی هەیە بەزۆر زەکاتەکەی بستێنێ، بەمەرجێ لەخاوەن ماڵی وەربگرێو لەسەر شێوەیەکی رەوا دابەشی بکا بەسەر شایستەکاندا، تەنانەت ئەگەر خاوەن سامان لافی بێ بەڵگە لێ بدا کە خۆی زەکاتی لێ دەرکردووەو داویەتی بە شایستەکانی زەکات، ئەو قسە رووتەی لێ وەرناگیرێ.

ج- دارایی نادیار **(الأموال الباطنة) خاوەنی دەتوانێ خۆی راستەوخۆ زەکاتەکەی بدا بە پێ شیاوان،** لەم رووەوە خۆی ئەمینداری شەرعە، خۆیو شیری خۆیو خوای خۆی، هەروەها خاوەنی دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی تەسلیمی بکا بەو لایەنە تایبەتانە کە هەڵدەستن بە دابەشکردنی زەکات بەسەر شایستە شەرعیەکانی دا. کاربەدەست بۆی نییە کە دەست بکا بە پشکنینو گەڕان بۆ دۆزینەوەی دارایی کە

شافیعییەکان لەگشت شتێکدا کاری پێدەکەن جگە لە گیانلەبەران.وە زۆربەی کۆنگرەو کۆڕە فقهییەکان کاری (عەمەل)ی پێ دەکەن.

**٤- زەکاتی قەرز** (زکاة الدیون):

قەرز یا والەسەر کەسێ، یاوا لەسەر کۆمپانیایێ، ئەویش یا هی کەسێکە یا هی کۆمپانیایەکە. کەواتە:

أ- کەسێ قەرزار بێ، چەندەی قەرز لەسەر بێ لە خەرمانی زەکاتەکەی دەری دەکا، کۆمپانیای قەرزاریش هەروا، مەگەر قەرزی خاوەن بەرهەم، کە بەرامبەری هەیە، کە پێی دەگوترێ (الدیون الإستثماریة) وەك ئەوە کەسێ یا کۆمپانیایەك قەرزی کردبێ بۆ کڕینی خانوویەك یا بۆ کڕینی ئوتومبیلێ، لەکاتی وادا لەکۆی ماڵی زەکات لەخۆگر دەرناکرێ، بەڵام هەر قیستی لەم جۆرە قەرزە بەرهەمدارەیش درایەوە، ئیتر ئەو ساڵە ئەو قیستە زەکات نادرێ.

ب- وەکی تریش قەرز چی هی کەسێ بێ وەچی هی کۆمپانیاکە بێ، ئەگەر تەما پێماو بوو، واتە ئومێدی قەوی بوو کە قەرزارەکە توانای دانەوەی هەیەو سەرچەوت دەرناچێ، ئەوە دەخرێتە پاڵ خەرمانی زەکاتو لەگەڵ سامانەکەی تریدا زەکاتی لێ دەدا. بەڵام ئەگەر قەرزار تەمای بەقەرزەکەی نەمابوو، لێی نائومێد بوویوو ئەوە ناخرێتە سەر خەرمانی زەکاتو زەکاتی لێ نادرێ، بەڵام ئەگەر دنیابوو لەپاش ساڵێ، یا چەند ساڵێ، دەستی کەوتەوە ئەوە زەکاتی یەك ساڵی لێ دەدرێو بەس، بەرێژەی ٢,٥٪ سەبارەت بەم بابەتە فەتوایەك دەرچوو، **لەکۆڕی دووەمی بابەتە هاوچەرخەکانی زەکاتەوە دەفەرموێت:**

یەکەم: لە شتە زەکات لەخۆگرەکان هەموو ئەو قەرزانە دەردەکرێن، کە کارێکی بازرگانییان پێ ئەنجام دەدرێ، بەمەرجێ لەلای قەرزار، لەشوێنی ئەو قەرزانە،

سامانی راگیراوی وا نەبێ، کەزیادبن لە پێویستییە سەرەکییەکانی خاوەنەکەیان، سامانی راگیراو واتە: (عروض قنية : أصول ثابتة).
دووەم: لە شتە زەکات لەخۆگرەکان ئەو قەرزە بەرهەم دارانە، دەردەکرێن کە پرۆژەی پیشەسازییان پێی ئەنجام دەدرێ، بەمەرجێ لەلای قەرزار بەرامبەر بەو قەرزانە سامانی راگیراوی وانەبێ کە زیاد بن لە پێویستیە سەرەکییەکانی خاوەنیان.
سێیەم: قەرزی خانووسازی درێژ خایەن، کەواباوە بەچەند وارە — قسط یکی درێژ ماوە دەدرێتەوە، دەبێ قەرزار چەندەی لەو ماڵە لەلا ماێ زەکاتی بدا، بەڵام وارە ساڵانە دراوەکانو وارەکات هاتووەکانی لێ دەردەکا، بەمەرجێ باقیمەندەکەی بگاتە رادەی زەکات.

## ١- گواستنەوەی زەکات (نقل الزكاة):

بنەڕەت ـ ئەصل ـ لە زەکاتدا ئەوەیە کە لە دەوڵەمەندانی شوێنی وەردەگیرێو دەدرێتەوە بە هەژارانی ئەو شوێنە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا گواستنەوەی زەکات لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە زۆرکاتدا دروستە، کە فەتواکانی کۆڕی دووەم، سەبارەت بەبابەتە هاوچەرخەکانی زەکات، باسیان دەکات کە بریتین لەمانە:
یەکەم: بنەڕەت لە دانی زەکاتدا ئەوەیە کە لەو شوێنەدا دابەش بکرێ کە ماڵە زەکات لێ دراوەکەی لێیە، نەك لەو شوێنەدا کە زەکاتدەری لێیە، بەڵام هەرکاتێ بەرژەوەندیەکی ئاشکرا هەبوو، دروستە لەشوێنی ماڵەکەوە راگوێز بکرێ بۆ شوێنێکی تر. لە بابەتەکانی بەرژەوەندی گواستنەوەیە ئەم خاڵانەی خوارەوە:
أ- گواستنەوەی بۆ بەرەی غەزا لە رێگەی خودادا.

ب- گواستنەوەی بۆلای ڕێکخراوە بانگەوازییە ئیسلامییەکانو ڕێکخراوە فێرکارییەکانو ڕێکخراوە تەندروستیەکان، بەمەرجێ شایانی پێدانی زەکات بن، چونکە یەکێکن لەو هەشت خەرجگایانەی کە زەکات دابەش دەکرێ بەسەریاندا.

ج- گواستنەوەی بۆ ئەو ناوچانەی کە تووشی گرانیو قاتو قڕیو برسێتی دەبن، کەناوبەناو، لەملاولای جیهان موسڵمانان تووشی کارەسات دەبن.

د- گواستنەوەی بۆ خزمانی زەکاتدەرەکە، کەشایستەی زەکات وەرگرتن بن،

**دووەم:** گواستنەوەی زەکات لە شوێنی سامانەکەوە بۆ شوێنێکی تر، بێجگە لەم خاڵانەی پێشوو، گەرچی برێتی زەکات دەکەوێو زەکاتەکەی لەکۆڵ دەخا بەلاّم کارێکی باشە، بەهەرحاڵ زەکات لەهەرکوێ بدرێ دەبێ بدرێ بە پێشیاو، دەنا بری زەکات ناکەوێ.

**سێیەم:** مەبەست لە شوێنی زەکات ئەو شارەیە کە خەرمانی زەکاتەکەی لێیە، لەگەڵ ئەو دێهاتو ناوچانەی تر کە سەر بەو شارەن، بەمەرجێ بەقەد ماوەی نوێژ کورتکردنەوە لێی دوور نەبن، کە نزیکەی (٨٢کم)ە، چونکە ئەوە هەمووی وەك یەك جێگە وایە.

**چوارەم:** جێگەی سەرفترە ئەو شوێنەیە کە سەرفترە دەرەکە لەوێیە، چونکە ئەمەیان زەکاتی سەرە، زەکاتی سامان نییە.

**پێنجەم:** ئەمە چەند کارو مامەڵەیەك کە لەکاتی گواستنەوەدا مەودایان پێ دەدرێ:

أ- دەستوبرد کردن لە دەرکردنی زەکاتی سامان لەپێش کۆتایی ساڵدا، هەتا لەگەڵ تەواوبوونی ساڵدا، بگاتە دەست پێشیاوانی، بەمەرجێ هەموو مەرجەکانی تری زەکات هەبن، بەلاّم زەکاتی سەرفترە پێش ناخرێ لەیەکی ڕەمەزان.

ب- دواخستنی دەرکردنی زەکات بەقەد ماوەی رێ، ئەوەندە هەتا دەگاتە دەست شایستەکان.

بەڵێ بەڵگەی دروستبوونی گواستنەوەیە ئەم راستییە کە دەفەرموێ: (نەتەوەی ئیسلام یەك نەتەوەیە)وەکوە تریش بارودۆخی گشتی موسڵمانان ئەمڕۆ دیسان پشتگیری ئەوە دەکا، کە گواستنەوەی زەکات دروست وا بەبەرچاودوە کە لە جیهاندا ئەمڕۆ زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان گیرۆدەی هەژاریی ناهەموارو رەشورووتی بوون، وەهەندێ وڵاتی ئیسلامی باری ژیانیان خراپ نییە، هەر نەبێ هاوڵاتی گوزەرانێکی سەروبەری هەیە، دەی باشە ئەو وڵاتە ئیسلامیانەی کە برسێتی زۆری بۆیان هێناوەو قڕی تێیان خستووە، چۆن دروستە کە پشتگوێ بخرێن‌و بێ یاریدە بێننەوە، هەتا رێکخراوە نەصرانی خوازەکان‌راویان بکەن‌و گومڕاو سەرگەردانیان بکەن، دیارە کە شتی ئاوا تاوانە.

**٢- قەرز داشکاندن بۆ قەرزار برێتی زەکات ناکەوێ، با قەرزارەکە نەداریش بێ،** چونکە نیاز (نیەت) مەرجە لەکاتی دانی زەکاتدا، هەروا کردنی لایەنە شایستەکان بە خاوەنی ئەو ماڵەی کە وەری دەگرن لەباتی زەکات مەرجە شایستەییەکەی لەبەر هەژاری بێ، یا لەبەر هەر هۆیەکی تربێ.

لە فەتوای کۆڕی یەکەم، سەبارەت بەبابەتە هاوچەرخەکانی زەکاتدا دەفەرموێ: (خاوەن قەرزێ نەتوانێ قەرزەکەی لە قەرزاری نەدارا بسەنێتەوە، مافی ئەوەی نییە کە ئەو قەرزە دابشکێنێ بۆ ئەو قەرزارە لەباتی زەکات، با قەرزارەکەیش زەکاتی پێ بشێ، ئەمە بۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەرعە).

**<u>ئەمە چەند شێوەکارێکە کەپەیوەندیان بەم بابەتەوە هەیە:</u>**

أ- ئەگەر زەکاتدەر زەکاتی دا بەقەرزاری خۆی، وە زەکات وەرگری قەرزار ئەو زەکاتەی لەباتی قەرزی سەری دایەوە بەقەرزدەر، بەبێ ئەوە لە پێشەوە لەسەر ئەوە

رێك بكەون‌و ئەوەیان بەمەرج گرتبێ، ئەوە بەزەكات دادەمەزرێ‌و بری زەكات دەكەوێ، ئەمەش رای زۆرینەی زانایانی شەرعە.

ب- ئەگەر قەرزدەر زەكاتی دا بە قەرزداری خۆی، بەمەرجێ ئەوە كە لە باتی قەرزەكەی سەری بیداتەوە بەخۆی، یا یەككەوتن لەسەر ئەوە وەری بگرێ‌و بیداتەوە بەهۆی لەباتی قەرزەكەی، ئەوە نە زەكات دانەكە دادەمەزرێ‌و، نەبری زەكات دەكەوێ، ئەمیش رای زۆرینەی زانایانی شەرعە.

ج- ئەگەر قەرزار بەقەرزدەری گوت: زەكاتم بدەرێ، هەتا قەرزەكەت بدەمەوە، ئەویش وایكرد، ئەوە بری زەكات دەكەوێ، بەلاّم مەرج نییە كە قەرزار هەمان مالّ لەباتی قەرزەكەی سەری بداتەوە بە خاوەن قەرزەكەی.

د- ئەگەر خاوەن مالّ بە قەرزاری گوت: ئەی فیسارەكەس، ئەو قەرزەی مـن كـەوا لەسەر تۆ بیدەرەوە پێم، مەرج بێ لە جیاتی زەكات بیدەمەوە بەخۆت، ئەویش بەگوێی كردو قەرزەكەی دایەوە، قەرزدانەوەكە دادەمەزرێ، بەلاّم مەرج نییە كە لە باتی زەكات بیداتەوە پێی.

## ٧- پێشخستن‌و دواخستنی زەكات

دروستە زەكات پێش وەختو بۆ ماوەی سالێك‌و زیاتر، یان كەمتر بدرێ بەم مەرجانەی خوارەوە:

١- زەكاتدەرەكە رادەی زەكات كەوتن (نصاب الزكاة)ی هێشتا هەبێ.

٢- ئەوەی زەكاتەكەی دراوەتێ هێشتا شایستەی زەكات پێدان بێ.

٣- زەكاتدەرەكە هێشتا زەكاتدانی لەسەربێ.

شایانی وتنە، ئەگەر دەولەت خۆی زەكاتەكەی وەردەگرت ئەوە ئەو بەدرێژایی وەخت شایستەی زەكات پێ دانە.

فەتوای کۆڕی یەکەم (الندوة الأولى)یش کە بۆتاوتوێکردنێکی هاوچەرخانەی زەکات گیراوە دەڵێ:

ڕەچاوکردنی ئەوماڵەی کە بەئەگەری (واجب) بوون دراوە لەزەکاتدا، بەزەکاتی پێش وەخت.

**هەرماڵێك بەئەگەری (واجب بوون) پێش وەخت لەزەکاتدا درابێ بەزەکاتدانی پێش وەخت دادەنرێ بەمەرجێ:**

١- زەکاتدەرەکە ئاستی زەکات کەوتن (نصاب الزکاة)ی لەدەستدا مابێ.

٢- زەکات پێدراوەکە بە شایستەی زەکات پێدان مابێ.

٣- زەکاتدەرەکە هێشتا زەکاتدانی لەسەربێ.

ئەمەیش بۆچوونی زانایانی (فقه)ە، جگە لە مالکییەکان.

خۆئەگەر هەرکام لەم مەرجانە نەما ئەوا ماڵە دراوەکە دەچێتە بابەتی (خێرو صدقە) کە ئەگەر کەسە پێشیاوەکە لە زەکات دەرەکەی وەرگرتبوو نابێ لێی بستێنێتەوە، بەڵام ئەگەر وەرگرتنەکە لەلایەن دەزگای زەکات یان فەرمانڕەوای وڵاتەوەبوو، ئەوا بۆی هەیە لێی بستێنێتەوە کە زانرا ماڵە دراوەکە لە واجبی زەکات زیادە، بەو مەرجەی هێشتا دابەش نەکرابێ بەسەر پێ شیاوانیدا.

## دواخستنی زەکات

زەکات جگە لەم حاڵەتانەی خوارەوە نابێ لەکاتی خۆی دوابخرێ:

١. چاوەڕوانکردنی هەژارێکی زیاتر هەژار یان شیاوتر.

٢. بۆ لایەنێکی کەڵك دارتر.

٣. زەکاتدەرەکە ماڵی بەپارەبووی وەك پێویست نەهاتبێتە دەست.

٤. دەتوانێ بیکات بە پارە، بەڵام تووشی زیانێکی ماڵی دەبێ.

٥. وێنەی ئەم حاڵەتانە، وەك ئەوە تووشی شكستیەكی بازرگانی بووە، پێویستی بە ماڵی زیاتر هەیە لە دەستیدا بێ، لەم حاڵەتەشدا دەتوانێ زەكاتەكە دوابخات بۆئەوەی كەڵك لەماڵە زەكات ئامێزەكە وەربگرێت.

## ٨- پارەدان لەباتی زەكاتەكە:

حەنەفیەكانو هەندێ تر لە زانایانی (فیقە) زەكاتو سەرفیترەو هەموو جۆرە كەفارەتێكیان لادروستە كە لە باتی خۆیان پارەكەیان بدرێ بە پشت بەستن بە چەند فەرموودەو ئاسارێك كە لەم بارەیەوە هەن هاوكات لەگەڵ ئەوەدا زۆرینەی زانایانی فقە ئەمەیان رەوا نەبینیوە (شیخ الإسلام إبن تیمیة) دەفەرموێ: واچاكە لەم بارەیەوە بەرژەوەندی باڵاو پێویستی پێشیاوان لەبەرچاو بگیرێت، واتە: بزانرێ لەم دوانە (پارە، یاخودی زەكاتەكە) بۆ ئەوان كامیان باشترەو لەبەرژەوەندی زیاتری ئەواندایە ئەویان بدرێ، ئەگینا دروست نییە پارە لەباتی بدرێ.

ئەم بۆچوونە بەهێزترە، بەتایبەت لەم سەردەمەی ئێستاماندا كە خودی ماڵە زەكاتەكە بۆ هەژاران سەختە، بەتایبەت تر لە شارەكاندا كە خودی ماڵە زەكاتەكە وا پێ دەچێ، خەرج كردنو بەكارهێنانی ئاسان نەبێ بۆیان.

## ٩- وەكیل گرتن بۆ دەركردنی زەكات دروستە.

## ١٠- زانایانی (فیقە) یەك دەنگن لەوەدا كە نییەت مەرجە بۆ پاداشتگەیشتنی زەكاتدەر،

هەروەها مەرجیشە بۆ دروست بوونو لەملكەوتنی زەكات، بەپێی فەرموودەی (إنما الأعمال بالنیات) بەڵام ئەی ئەگەر خاوەن دەسەڵاتی وڵات بەزۆر لێی بستێنێ هەر لەكۆڵی دەكەوێ؟

راجیاوازییەكی گەورە لە بۆچوونی زانایانی (فیقە)دا لەم بارەیەوە هەیە: جەماوەریان ئەوەیان لاپەسەندە كە لە ملی ناكەوێ بەڵام مامۆستای پایەبەرز

مامۆستا (قەرزاوی) پشتگیری ئەو رایە دەکات کە دەڵێ: مادام موسڵمانەکە بەگشتی لە نیازی دەرکردنی زەکاتەکەدا بێ، لەملی دەکەوێت‌و، وەریش دەگیرێ.

**١١- ئایا زەکاتدەر لەسەریەتی کە بەهەژارەکە رابگەیەنێ، ئەوە زەکاتە ئەیداتێ؟**

زانایانی (فیقە) لەم بارەیەوە رایان جیاوازە رای پشتگیری کراو ئەوەیە کەلەسەری نییە.

بەڵکو هەیانە دەفەرموێ: هەژارەکە هەست بە دڵشکاوی دەکات لەبەرئەوە کەراهەتی هەیە.

**١٢-بەرهەمهێنانی (إستثمار) ماڵی زەکات:**

لە کۆڕی سێیەم کە بۆ تاوتوێکردنی کێشە هاوچەرخەکانی زەکات گیرا فەتوایەك دەرچوو بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشداربوانی کۆڕەکە ئەو توێژینەوانەی کە لەبارەی بەرهەمهێنانی زەکاتەوە خرابوونە بەردەمی، راگۆڕینەوەیان لەسەرکردن‌و گەیشتنە ئەم رایانەی خوارەوە:

کۆڕەکە جەخت لەسەر بڕیاری ژمارە (٣) ١٩٨٦/٧/٣ی مجمع الفقه الإسلامی، دەکات بۆ بەگەڕ خستنی ماڵەکانی زەکات لە هەموو ئەو پرۆژانەدا کە بەرهەمیان دەبێ، وەبەچەند کۆگر (ضوابط)ێکەوە کە بڕیارەکە ئاماژە بۆ هەندێکی دەکات بڕیاری دروستبوونی (مبدئیا) بۆ داوە.

وە لەدوای راگۆڕینەوەیەك لەسەر ئەو باسانەی خراونەتە بەردەم کۆڕەکە لەم بارەیەوە گەیشتە ئەم دەرەنجامەی کە دەڵێ:

**بەرهەمهێنانی ماڵی زەکات بەم کۆگرانەی خوارەوە رەوایە:**

* یەخەگیری خەرجێکی زۆرو بەپەلە نەبووبێ، کە پێویست بێ ماڵە زەکاتەکە زوو دابەش بکرێ بۆی.

* ئەبێ بەرهەم هێنانی ماڵە زەکاتەکە وەك هەر ماڵێکی تر بەڕێگای ڕەوا بکرێت.

* کار لەسەر هەندێ شت بکرێت کە ماڵە بەرهەمهێنراوەکەو بەرهەمەکەشی مانەوەیان وەك ماڵێکی زەکات ئامێزو زەکات لەخۆگر مسۆگەر بکات.

* هەرکاتێ ئاتاجی پێ شیاوانی زەکات وای دەخواست کە زەکاتەکەیان بدرێتێ ئەوسا ئەبێ ماڵە بەرهەمهێنراوەکە بتوانرێ خێرا بکرێتەوە بەپارەو بۆیان خەرج بکرێت.

* ئەو بەرهەمهێنانە کە ماڵە زەکات لەخۆگرەکەیان تێدا دادەنرێ تێڕوانینیان تێدا بکرێ کە بەرهەم دەدەنو لە ئافات بەدوورن، وە بۆئەوەش ئەشێن لەکاتی ئاتاجو پێویستیدا بکرێنەوە بە پارەو ماڵێ کە بۆ خەرجکردن دەست بدەن.

* دەبێ بڕیاری بەرهەم هێنانی ماڵە زەکات لەخۆگرەکە لەو کەسانەوەبێ کە فەرمانڕەوای وڵات کۆکردنەوەو دابەشکردنی زەکاتی بەوان سپاردووە، ئەمەیش لەبەر ڕەچاوکردنی بریکارێتی شەرعی (النيابة العامة)، وە چاودێری کردنی بەرهەم هێنانەکە بدرێتە دەست کەسانی پسپۆڕو لێهاتوو دەست پاك.

**١٣- بەخاوەنکردنی زەکات، وەتاچ ڕادەیەکیش دروستە پڕۆژەکان بە ماڵی زەکات بەرپا بکرێن؟**

فتوای کۆڕی سێیەم (الندوة الثالثة) کە بۆ تاوتوێ کردنێکی هاوچەرخانەی زەکات گیرابوو دەڵێ:

* چوار ڕیزی یەکەم لە ئایەتی جێگەی خەرجی زەکاتدا کە دەفەرموێ (**إنما الصدقات للفقراء، والمساكين، والعاملين عليها، والمؤلفة قلوبهم**) ئەم چوار ڕیزە بە خاوەنکردنیان مەرجی لەملکەوتنی زەکاتەکەیە، بە خاوەنکردنیشی واتە پێدانی بڕە پارەیەك، یاخود کڕینی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان وەك ئامڕازە

پیشەیەکانو کەرەسەکانی پیشەسازی، وەبخرێنە بەردەست کەسانێك کە شایستەی زەکات پێدان بن‌و توانای کارکردنیان هەبێ..

* دروستە پرۆژەی بەرهەمهێنان بەماڵی زەکات بەرپا بکرێت‌و بدرێ بەوانەی کە شایستەی زەکات پێدانن تاخودی خۆیان، یان کەسانێك لەبری ئەوان بەڕێوەی ببەن، واتە بکرێنە خاوەنی پشکەکانی (اسهم)ی پرۆژەکەو قازانجەکەی لەخۆیاندا دابەش بکەن.

* هەروەها دروستە پرۆژەکانی خزمەتگوزاری، وەك خوێندنگاکان‌و نەخۆشخانەکان‌و شوێنە پەنا بۆ براوەکان (الملاجیء)و کتێبخانەکان بەماڵی زەکات دروست بکرێن بەم مەرجانەی خوارەوە:

أ- تەنها سوود بەوانە بگەیەنێ کە شایستەی زەکات پێدانن، وە کەسانی تر بەرامبەر کرێیەك بتوانن سوود لەو خزمەتگوزارییانە وەربگرن، وەسودەکەشی بۆ ئەوانە بگەڕێتەوە کە شایستەی زەکات پێدانن.

ب- خاوەندارێتی پرۆژەکە بۆ پێشیاوانی زەکات بەردەوام بێ وە کاربەدەستی وڵات یان دەستەیەك لە باتی ئەو بەڕێوەی ببات.

ج- کە پرۆژەکە فرۆشرا، یان کۆتایی پێهات ئەنجامی کۆتایی پێهێنانەکە ماڵی زەکاتە.

## ١٤- جیاوازی نێوان باج (الضریبة)و زەکات، وە ئایا باج بە زەکات دادەنرێ؟

زانایانی هاوچەرخ لە (فیقه)دا یەك دەنگن لەسەر ئەوە کە باج بە زەکات دانانرێ، چونکە لەچەند روویەکەوە جیاوازی بنەڕەتیان هەیە: لەڕووی ماهیەت‌و حەقیقەتیانەوە وە لە رووی رادەی زەکات کەوتن (النصاب)و ئەندازەیانەوە وە لەڕووی جێگەی خەرجکردنیانەوە، هەروەها لەڕووی مەبەست‌و بۆ دانانیانەوە،

ئەمانەو وێڕای ئەوەش کە زەکات پەرستش (عِبادە)و فەرزێکی دارایی‌و سامانییە بەڵام باجەکان لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنرێن.. کۆڕی چوارەسیش ئامۆژگاری فتوایەکی لەم بارەیەوە بەشێوە خوارەوە دەرکردووە:

## زەکات‌و باج

کۆڕەکە داوا لە دەوڵەتە ئیسلامییەکان دەکات کە بەرنامە ڕێژیەك بکەن بۆ جێبەجێکردنی یاسای زەکات، بەمەبەستی کۆکردنەوەو دابەشکردنی لەسەر بنەمای پابەند بوون پێیەوەو دانانی چەند دەستەو تاقمێکی پسپۆڕ بۆ ئەم مەبەستە، کە خەرجیان لە ئامێزێکی تایبەت بگیرێ.

هەروەها کۆڕەکە داوایان لێ دەکات کە ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە دارایی‌و شتی ترەوە هەیە چاویان پیادا بگێڕنەوەو دەستکاری بکرێن‌و ئاراستە بکرێت بەپێی بۆچوونی ئیسلامیی.

١- لە بنەڕەتدا دەبێ بودجە (میزانیە)ی دەوڵەت لە داهاتی دارایی‌و سامانە گشتییەکانی دەوڵەت دابین بکرێن، جا ئەگەر داهاتەکە بۆ ئەم مەبەستە بەس نەبوو، ئەوکاتە دەوڵەت بۆی هەیە بەشێوەیەکی دادگەرانە (عدالة) باج لەسەر سامانی گەل دابنێ بۆ خەرجکردنی لەو شوێنانەی کە دروست نییە سامانی زەکاتیان تێدا خەرج بکرێن، هەروەهایش بۆ بەربەستکردن‌و ڕێگرتن لەکەم هێنانێك کە روو دەکاتە زەکات‌و بەشی پێشیاوانی ناکات.

٢- چونکە بەڵگەی بەرەوابینینی باج یاسا بەرژەوەندیە گشتییەکانە، دەبێ لە دانانی باجەکەدا بەرژەوەندییە زیندووەکان رەچاو بکرێن، ئەمەیش لەبەر رۆشنایی یاسای دارایی ئیسلامی‌و پابەندبوون بە یاسا شەرعیە گشتییەکان‌و مەبەستە لەبەرچاوگیراوەکانی شەریعەت.

٣- هۆکاری دانانی باجەکان دەبێ ئاتاجو پێویستییەکی راستو ئاشکرا بێ.
٤- دەبێ بەپێوەرێکی شەرعی، دادگەری تێدا رەچاو بکرێت لەرووی قورسکردنی شانی هاولاتیانەوە، وە دانانو بەدەستهێنانو خەرجکردنەکەی دەبێ لەژێر چاودێرییەکی متمانە پێکراوو پسپۆڕدا بێت:

* باج دان بە دەوڵەت ناکەوێتە بریتی زەکات، چونکە ئەم دوانە لەسەر چاوەی (تەکلیف) واتە لەسەر دانانن، وە مەبەست تێیاندا لەیەك جیاوازن، سەرەڕای جیاوازییان لە خەرمانی لێ دەرچوون و ئەندازەی (واجب) تێیاندا، وە ئەو بڕە باجانەی بە دەوڵەت دراون لە ئەندازەی زەکات دەرناکرێن .

* ئەو باجەی کە دەوڵەت لەسەر خەڵکی دایناوەو دەبێت لە ساڵدا بدرێتو هێشتا ساڵی نەهاتۆتەوە لە خەرمانی زەکات دەردەکرێت، چونکە ئەویش بۆ خۆی مافێکە دەبێت بدرێ .

* کۆڕەکە سپاردەو ئاراستەی بۆ دەوڵەتە ئیسلامیەکان ئەوەیە کە یاسای باجەکان دەستکاری بکەن بەشێوەیەك ڕێ بدات زەکاتەکە لەبڕە باجەکان دەربکرێت، ئەمەش بۆ سوك کردنی بار لەسەر زەکاتدەرانە .

**١٥- زەکاتی ماڵی ( حەرام ) :**

فتوایەك لە کۆڕی چوارەم بۆ بابەتە هاوچەرخەکانی زەکات دەرچووە، دەڵێ :
ماڵی حەرام بریتیە لەو ماڵەی شەرع دانەری کاربەجێ، کە خوای پەروەردگارە، راگرتنو کەڵك لێ وەرگرتنی قەدەغە کردووە جا ئیتر قەدەغە کردنەکە لەبەر خودی ماڵەکە خۆی بێ، چونکە پیسەو زیان گەیاندنەکە لە خۆیدایە، کە بەزاراوەی شەرع پێی دەگوترێ (**الحرام لذاته**) وەك مەیو مردارەوەبوو، یان قەدەغەکردنەکەی لەبر خودی خۆی نەبێ، بەڵکو لەبەر ناشەرعی رێگای بەدەستهێنانی بێ کە بەزاراوەی شەرع پێی دەوترێ (**الحرام لغیره**) وەك ماڵی زدوت کراو کە بەرێگای

زەوتکردن بەبێ ڕەزای خاوەنەکەی براوە، یاخود بەشێوەیەك وەرگیرابێ کە شەرع بڕیاری لەسەر ئەو شێوەیە نەداوە، با ڕەزامەندیشی تێدا بێ، وەك ماڵێك بە ڕێگای سوو یان بەرتیل هاتبێتە دەستەوە.

* ماڵ لە دەستی (حەرام) لەبەر ڕێگای بەدەست هێنان نابێتە خاوەنی ئەو ماڵە، هەرچەندە ماوەیەکی درێژیش لە دەستیدا بێ، وە لەسەریەتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی یان بۆ میراتگری خاوەنەکەی، ئەگەر ئەیزانی کێ یەو دەیناسێ، خۆ ئەگەر بێ ئومێدبوو لە دۆزینەوەو ناسینی خاوەنەکەی ئەوا لەسەریەتی لە یەکێ لە ڕێگا خەیرەکانەدا، بە نیازی خێری خاوەنەکەی خەرجی بکات بۆ ئەوەی لەبەر پرسیاری ئەو ماڵە (حەرام)ە، ڕزگاری بێت .

* ئەگەر لەبری کارێکی حەرام کرێیەکی وەرگرت، ئەوە لەسەر وەرگرەکەیەتی لەیەکێ لە ڕێگا (خێر)ەکاندا خەرجی بکاتو نەیگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە لێی وەگرتووە .

* ماڵی حەرام نادرێتەوە بەو کەسەی لێی وەرگیراوە، ئەگەر هاتوو کەسەکە سوربوو لەسەر بەکارهێنانی لە ڕێگای ناشەرعی یەکی وادا، کە دەبووە هۆی حەرام کردنی ماڵ، وەك مامەڵە سوو ئامێزەکان، بەڵکو ئەبێ دیسان ئەمەیش لە ڕێگایەکی (خێردا) خەرجی بکات .

* ئەگەر نەدەکرا خودی ماڵە حەرامەکە خۆی بگێڕێتەوە ئەوا لەسەریەتی وێنەی ماڵەکە، یان نرخەکەی بداتەوە بەخاوەنەکەی، ئەگەر نەیزانی کێ یە، ئەگینا وێنەی ماڵەکە یان نرخەکەی لە ڕێگایەکی (خێر)دا خەرج بکات بەنیازی (خێر) بۆ خاوەنەکەی .

* هەر ماڵێ کەخۆی لەبەر خۆی (حەرام)ە، واتە (**المحرم لذاتە**)یە، هەرگیز نابێتە جێگای زەکات لێدان، چونکە لای شەرع بە ماڵێکی نرخدار ناناسرێ، وە ئەبێ بە رێگایەك کەشەرع بۆی داناوە خۆی لێ ڕزگاربکات .

* ئەو ماڵەی کە لەبەر رێگای بە دەستهێنانی (حرام)ە، واتە(**الحرام لغیرە**)یە، ئەویش زەکات لەسەر لەدەستابووە کەی نی یە چونکە مەرجێك کە بریتیە لە خاوەندارێتی بۆ ماڵی زەکات تێیدا نەهاتووەتە دی، بەڵام هەرکاتێ بۆ خاوەنەکەی گەڕایەوە، دەبێ ئەو زەکاتی ساڵێکی لێبدا، هەر چەندە ساڵ زۆریشی بەسەردا چووبێ، لە ڕای پەسەندکراودا .

* لە دەستدا بووی ماڵی (حرام) ئەگەر بۆ خاوەنەکەی نەگێڕایەوەو ئەندازەی زەکاتەکەی لێ دەرکرد، تاوانی ئەوەی لەدەستیدا ماوە دەمێنێت، ئەویش کە دەری کردووە ئەرکی خۆی بەجێ هێناوەو دەبوو هەر بیکات، بە دەرکردنی زەکاتیش ناچێت، وەهەتا هەموو مەڵەکە بۆ خاوەنەکەی نەگێڕێتەوە، گەردنی ڕزگار نابێت، ئەگەر خاوەنەکەی دەناسی یاخود نەیکات بە (خێر) بۆی ئەگەر بێ هیوا بوو لە دۆزینەوەو ناسینی خاوەنەکەی .

## ١٦- ئایا بەمردن زەکات لە کۆڵ دەکەوێت ؟

زانایانی (**فقە**) یەك دەنگن لەوەدا کە زەکات بە مردنی خاوەن ماڵ لە کۆڵ ناکەوێ، بەڵکو ئەو زەکاتە لەمیراتەکەی دەردەکرێ، هەرچەندە رای نەسپارد بێ کە لێی دەربکەن، بەڵام حەنەفیەکان دەفەرموون، ئەگەر رای نەسپاردبوو، دەرناکرێ، رای جەماوەر پەسەندەو پشتگیری دەکرێت، جا لەسەر ئەم بنەمایە میراتگرانی کەمردوە لەسەریانە زەکاتی ماڵە میراتەکە دەربکەن، ئەوسا میراتەکە لە نێوانیاندا دابەش ببێ، چونکە زەکات وەکو قەرز مافێکی سامانی یە، دەبێ بدرێت و بە

مردن لە کۆڵی خاوەن ماڵ ناکەوێ، بەڵام نوێژ وانی یە، چونکە ئەو ئەرکێکی جەستەیی یە، راسپاردەیی و بریکاری تێدا دروست نی یە، خۆ زەکات وانی یە .
کە واتە میراتگران لەسەریانە بەر لە دابەش کردنی ماڵی میراتی زەکاتی میرات لێ گرەکەیان بدەن، چونکە زەکات قەرزێکە دەبێ بخرێتە پێش (**وصية**) یشەوە .
وێرای ئەمە شافیعیەکان لەسەر ئەوەن کە زەکات قەرزێکی وایە پێش قەرزی مرۆڤەکانیش دەخرێت لەبەر فەرمودەی (**فدين الله أحق أن يقضي**) واتە قەرزی خوا شایستە ترە بەدانەوە .

**١٧- هەروەها زەکات بە تێپەڕبوونی کات بەسەر نەدانیدا لەمل ناکەوێ، هەرچەند ساڵ زۆریش بەسەریا تێ پەڕ بووبێ، هەر لە ئەستۆدا دەمێنێتەوە.**

**١٨- ئایا دروستە زەکات بدرێ بە کۆمەڵ و دەستە خێر خوازەکان و صندوقی زەکات؟**

بەڵێ دروستە بەمەرجێ جێی باوەڕ بن و متمانەی ئەوەیان لێ بکرێ کە زەکات و خەیرەکان دەگەیەننە پێ شیاوانیان ئەمیش دادەنرێ بە وەکیل گرتن بۆ گەیاندنی زەکاتەکە بە پێ شیاوانی زەکات .

**١٩- ئایا رادەی زەکات کەوتنی دراوو پارەی کاغەز بە (زێر یان بە زیوو) دادەنرێ؟**

رای پەسندو پشتگیری کراوی زانایانی هاوچەرخ ئەوەیە کە بەزێر، واتە ئالتون دادەنرێ، کە واتە ئەگەر پارەی کاغەز گەیشتە بایی (٨٥ گرام) ئالتونو لە دەستی خاوەنیدا ساڵی بەسەرا هاتەوە، ئەوسا ئەو پارەی (**قطر**) کە ریالە ئێستا دەکاتە (٤٢٥٠)ریال .

**٢٠- ئایا ماڵی ناتەواوان ( القصر ) زەکاتی دەکەوێ ؟**

جەماوەری زانایانی (فقه) یەك دەنگن لەوەدا کەماڵی شێت و هەتیوو دەست بەسەرا گیراوان لە دەستکاری ماڵیاندا (**المحجور علیهم**) زەکاتی دەکەوێ .

**٢١- ئایا مەرج گیراوە کە خاوەن ماڵ بە درێژایی ساڵەکە رادەی زەکات کەوتنی هەبێ، بۆ ئەوەی زەکاتی بکەوێ ؟**

لای (حەنەفیەکان) ئەم مەرجە نی یە، تەنها ئەوەندە هەیە کە خاوەن ماڵ لە سەرەتای ساڵەوە رادەی زەکات کەوتنی هەبێ بۆ ئەوەی ساڵی زەکات کەوتنەکەی لە وێوە دەست پێ بکات، وە لە کۆتایی ساڵیشدا هەیبێ بۆ ئەوەی (واجب) ببێ لەسەری وە وتویانە کەم کردنی ماڵ لە رادەی زەکات لە میانەی سەرەتای ساڵ و کۆتای ساڵدا کارناکەتە سەر واجب بوونەکە، رای پەسەند و پشتگیری کراویش ئەمەیە، جەماوەری زانایانی (فقه) پێچەوانەی ئەم رایانە هەیە .

**٢٢- ئایا دەشێت زەکات بە شێوەی موچەی مانگانە بە هەژاران بدرێت ؟**

لاری یەك لەمەدا نی یە، وە بگرە بۆ نەهێشتنی ئاتاجی هەژاران ئاوا باشترە، بەمەرجێ زەکاتەکە تایبەت بکرێت و لە ماڵەکانی تر بخرێتە لاوە .

**٢٣- لەناوچوونی ماڵ:**

ئەگەر بەر لە گەرانەوەی ساڵ رۆژی زەکات ماڵەکە لەناو چوو، خاوەن ماڵ هیچی لەسەر نی یە، بەڵام ئەگەر ماڵەکە هەمووی یان هەندێکی لە پاش گەیشتنە رادەی زەکاتو ساڵ رۆژی زەکات تیاچوو، ئالێرەدا زانایانی (فقه) رای جیاجیایان هەیە، ئەوەی ئێمە رامان لەسەر پشتگیری کردنیەتی رای مالکی و شافعیەکانە، کە دەفەرموون : ئەگەر لە ناووچوونی ماڵەکە بەهۆی پشتگوێ خستنو کەمتەرخەمی خاوەنەکەی بوو، یان بەهۆی ئەوەوە بووبێ کە بەبێ بەهانەیەکی گونجاو زوو زەکاتەکەی دەرنەکردبوو ئەوا لەسەریەتی زەکاتی هەموو ماڵەکەی بدات، بەڵام

ئەگەر زەکاتەکەی جیا کردبوودوەو نیازی لیّ هێنابوو، ئەوە زەکاتی ماڵەکەیەتی ئینجا زەکاتەکە تیاچوو ئەوە بڕیاری شافیعیەکان و مالیکیەکان هەرهەمان بڕیارە کە دەڵیّ : ئەگەر لە تیاچوونی زەکاتەکەدا کەمتەرخەمی کردبوو ئەوە لە کۆڵی ناکەویّ، ئەگینا لە کۆڵی دەکەویّ .

**٢٤- ماڵێك لەنێوان ساڵدا بەهۆی قازانج، یان هەرهۆیەکی ترەوە دێتە دەست دەخرێتە سەر سەرجەمی ماڵەکەی ترو هەردوانیان بەیەك زەکات زەکاتیان لیّ دەدریّ .**

بیّ ئەوەی پێویست بەوە بکات ماڵە بە دەست کەووتوەکە ساڵی بەسەردا بێتەوە بەمەش رای پەسەندەو پشتگیری کراوە .

## پایەی سێیەم

### ١- خەرجگای زەکات ( مصارف الزكاة )

خەرجگای زەکات ئەو کەسەیە یان ئەو لایەنەیە، کە زەکاتەکەی دەدرێتێ خوای گەورە ئەم بابەتەی نەهێڵاوەتەوە بۆ تێڕوانینی زانایان (**ألأجتهاد**) تەنانەت بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ بێت نەهێڵاوەتەوە بەڵکو خۆی راستەوخۆ لە قورئانی مەزندا روونی کردۆتەوەو دەفەرموێت : {إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ }التوبة٦٠ ، خوای مەزن و کار بەجێ خۆی لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ، زەکات تەنها بۆ هەژارانو کەم دەسانو کارگێرانی زەکاتو تازە مسوڵمانبوە، وە لە پێناوی ئازادکردنی کۆیلەکانو قەرزارانو رێگای خواو رێبوارانی دابڕاو لە وڵاتی خۆیاندایە .

جا ئیتر مسوڵمانی زەکات کەوتوو لەسەریەتی بۆ زەکاتدان بەوردی بگەڕێ بۆ پێ شیاوانی زەکات و لە دوای گەڕانێکی وردو تێڕوانینێکی تەواو زەکاتەکەی بدات، بەتایبەتی لەم سەردەمەی خۆماندا، کە (مەخابن) زەکاتدان بۆتە کارێکی خۆییو تاکە کەسی، خۆ لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانیدا(**خلفاء الراشدين**)کارێك بوو لە کارە گرنگەکانی دەوڵەتی مسوڵمانان، هەروەها بۆ مسوڵمانان بۆ زەکات دانەکەی دەبێ چاکیو چاکترێتی (**ألأولويات**) رەچاو بکات، دەی با زەکات بدات بۆ کۆششو تێکۆشان لە پێناوی سەرخستنی ئایینی ئیسلامدا، وەبۆ ئەو کەسەی زیاتر هەژارو دەست کورتی ژیانەوە، بەوانەی قاتو قڕیو گرانیو مردنی دەرگای پێگرتوون، ئەوانەی کە نەبوونیو برسێتی یەکەیان بۆتە هەلی بەگاور کردنیانو لە دین لادانیان .

موسڵمانی زەکات کەوتوو دەتوانێت بە زەکاتەکەی ئەمانە لە مردنوتیاچوون ژیانیانو مردنەکەی تر کە بێ باوەڕبوون لە ئایین لادانە بپارێزێتو رزگار بکات، بۆیە زەکات بە دەوڵەمەندو کەسانێك کە توانای ئیشکردنیان هەیە نادرێ، هەروەها بە باوكو دایكو باپیرە نادرێ بە کوڕو بە کچ، وە بە کوڕەزاو کچەزا نادرێ، بە شێوەیەکی تر بڵێین بە بنەچەو وەچە (**الأصول وألفروع**) نادرێت، بەڵام بۆ خزمانی تر وەك خوشكو برا، مامو خاڵو پوروو وێنەیان دەشێت، بە مەرجێ ببنە یەکێك لە خەرجگای زەکات، هەروەها زەکاتی مێرد بە ژنی خۆی ناشێت، چونکە ژن بژێوی لەسەر مێردەکەیەتی، زەکاتی کەسێك نادرێ بەیەکێ کەبژێوی لەسەر ئەو بێ، چونکە ئەوە وەك ئەوە وایە زەکاتەکەی بەخۆی بدات، وەلێ زەکاتی ژن بۆ مێردی خۆی دروستە، هەروەها دروستە زەکات بدرێت بەلایەنە خێر خوازە ئیسلامیەکان ئەوانەیان کە سەرپەرشتیان لە دەست کە سانی متمانە پێکراوی موسڵماندایە، بەڵام زەکات ناشێت بدرێ بەو لایەنانەی کە نایگەیەننە پێشیاوانی زەکات .

<u>وە ئیتر لێرەدا دەست دەکەین بە راڤەو روونکردنەوەی ئەو هەشت خەرجگایە کە دروستە زەکاتیان بدرێتێ هاوڕێ لەگەڵ ئەو بڕیارو فتوایانەی لە کۆڕو کۆمەڵە (فقهی) یەکانەوە دەرچووە.</u>

## ٢-هەژاران و کەم دەستان :

هەژار ئەو کەسەیە هیچی نی یە، کارێکی شایستەش کە پێی بژی نی یەتی، بەڵام کەم دەست ئەو کەسەیە، کارێك یان داراییەکی هەیە، بەڵام بەشی ناکات، وەك فەرمانبەرێکی دەوڵەت کە مووچەکەی بەشی ناکات، یان کرێکارێك کە ژیانی بەوکرێیە بەڕێوە ناچێت .

پوختەی مەبەست : زەکات بەوکەسە دەدرێ کەکارێك یان سامانێکی نی یە، بەو کەسەش دەدرێ کەدارایی یان کاری هەیە، بەڵام بەشی تەنها (٥٠٪) یان زیاتری خەرجیەکانی ناکات .

هەژارو کەم دەستان لە زەکات نەوەندەیان دەدرێتی تا بەگوێرەی سەردەم پێویستیان نەهێڵرێ .

ئەمەش فتوایە کە لە خوارەوە لەکۆڕی یەکەم دەرچووە :

* زەکاتو رەچاو کردنی پێویستیە بنەڕەتیو تایبەتی یەکان :

أ- ئەم پێویستیە بنەڕەتیانە کە باسی زکات رەچاویان دەکات گشتگیرە بۆ سەرجەم مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلام، چ ئەو بەشەیان کە ژیان بێ ئەوان نابێت کە بە (**ضروريات**) ناودەبرێن، وە چ ئەو بەشەیان کە ژیانن کە بە (حاجيات) ناو دەبرێن، بۆ ئەوەی تا ژیانێکی گونجاو لەگەڵ باوو نەریتی سەردەم چ لە رووی کاتو چ لە رووی ژینگەی ژیانەوە دابین بکات، وە تا ژیانی دەستەبەری کۆمەڵایەتی (**التكافل ألاجتماعي**) لە نێوان موسڵماناندا بەدی بهێنێ.

ب- پێوەری ئەو بنەڕەتی یانەی کە زەکات بۆ هەژاری موسڵمان بەدی دەهێنێ ئەوەیە کە زەکاتەکە بۆ خۆراكو پۆشاكو هەموو ئەوانەی کە هەژارەکە شایستەیەتی، بێ زیادەڕەویو رەزیلی بیەوێ بەشی بکات، چ بۆخۆیو چ بۆ ئەوکەسەی کە ژیانی لە سەریەتی .

ج- ئەوانەی کە زەکات دەگەیەننە پێ شیاوانی، چ زەکاتدەران خۆیان بن، یان دەزگاکانی بن لە سەریانە، بە هەرچی هۆکاری شیاوو لە دەست بووندا هەیە بگەڕێن بە دوای ئەو کەسەدا کە زەکاتەکەی دەدەنێ، بە هۆکارێ کە هەستیان بریندار نەکاتو لە رێزیان کەم نەکاتەوە، تا دڵنیا بن کە ئەو کەسە پێ شیاوی زەکاتە وەپێویست ناکات زیاتر لەمەیان لێ داوا بکەن. وەك بەڵگە یان سوێندان،

مەگەر لەحالەتی کەوتنە گومان و لێ گۆڕاندا، یاخود زۆربوونی زەکات داواکردن، کە، هەندێ شتی وا هەبێ، وابگەیەنێ کە ئەوانە شایستەی زەکات پێدان نین .

**٣- کارگێڕانی زەکات (والعاملین علیها) :**

ئەمانە ئەوانەن کە هاوکارن لە کۆکردنەوەو دابەشکردنی زەکات بەسەر پێشیاوانیدا، کە هەموو ئەوانەی خەریکن بە کۆکردنەوەی زەکاتەکە لە ئەملاو ئەولای ولات (**السفاة والجباة**) و ژمێریارو فەرمانبەرانو وێنەی ئەمانە دەگرێتەوە .

بەکورتی : دەزگای بەڕێوبەرایەتی خەرمانی زەکات، ئەمەی خوارەوەش بە شێکە لە فتوایەکی کۆڕی چواردەم کە بۆ تاوتوێ کردنی کێشە هاوچەرخەکانی زەکات گیراوە دەڵێت :

* کارگێرانی زەکات بریتین لەو کەسانەی کەلێ پرسراوانی دەولەتی ئیسلامی دیارییان کردوون، یاخود ڕێیان داون، یان دەستەیەکی سەر بە دەولەت یان سەر بەکۆمەلگە ئیسلامیەکان هەلیان بژرادوون بۆ کۆکردنەوەو دابەش کردنی زەکات و هەر کارێکی تر کە پەیوەندی بە کاروباری زەکاتەوە هەبێ، وەك :

١- ڕاگەیاندنی (أحکام)ی زەکات بە جەماودر .

٢- ناساندنی دەولەمەندو خاوەن سامانەکان .

٣- ناساندنی پێشیاوانی زەکات .

٤- کۆکردنەوەی دابەشکردنی بەسەر پێشیاوانیدا .

٥- گواستنەوەی بۆ عەمارەکانی پاریزگاری‌و نگاداری زەکات .

٦- خستنە گەڕی زەکاتەکە بە ئومێدی زیادکردنو گەشە کردنی .

٧- بەرهەم هێنانی مالی زەکات بە پێی ئەو بنەماو مەرجانە (**الضوابط والقیود**)ی کە لەڕاسپاردەی یەکەم (**التوصیة الأولی**)ی کۆڕی سێیەمدا هاتووە:

**※ ئەو نیشانەی کە بە کارگێرانی زەکات دەسپێرێن دوو جۆرن :**

أ- هەندێکیان دەسەلاتی بالاو پیێ سپاردنێکی فراوانن، ئەوکەسانەی ئەم جۆرەیان پیێ دەسپێررێ مەرجی تایبەتی یان هەیە، کە زانایانی (فقە) دیارییان کردوون کە ئەمانەن :

١- مسولمان بێ.

٢- نێرینە بێ.

٣- دەست پاك و متمانە پێکراو بێ.

٤- لەزانیاریی زەکاتتدا شارەزاییەکی باشی هەبێ.

ب- هەندێ کاروباری تر هەن دەکرێ بە کەسانی تر بسپێررێن هەرچەندە :

١- کارێگێرانی زەکات شایستەن ئەو موچەیە وەربگرن لەلایەن ئەو شوێنەوە دیاری کراوە و موچەکەی بۆ بڕیونەتەوە بەمەرجێ لە (**أجرة المثل**) واتە کرێی وێنەی نیشینەکەیان زیاتر نەبێ بەرامبەر بە کارەکەیان، وە دەبێ لە هەشت یەکەکەی بەشی کارگێران بێ، جا ئەگەر هەژاریش نەبن، هەر بۆیان هەیە وەریبگرن، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا دەبێ ئاگاداری بێ ئەوەی بکرێ کە سەرجەمی ئەوەی خەرج دەکرێ بۆ خۆیانو رێکخستنی کەرەسەی کارەکانیانو خەرجی یە ئیداری یەکانی تر لە هەشت یەکەی زەکاتەکە تێ پەڕ نەبێ، وە بە ئەندازەی پێویست کاری (**وظیفي**) بدرێ، وە موچەکان هەموویان، یا هەندێکیان چاك وایە لە بوجەی دەوڵەت دابین بکرێ، بۆ ئەوەی داهاتی زەکات لە خەرجگاکانی تریدا خەرج بکرێت.

٢- کارگێرانی زەکات بە هیچ شێوەیەك نابێ بەرتیل، یان دیاری، یان بەخشیش، چ ماڵ بێ، یان پارە لە کەس وەربگرن .

* شـوێنەكانی بـەڕیوە بردنـی دەزگاكـانی زەكـات هەرچییان پێویـسـت بـێ، وەك مـافوری ڕاخـستنو ئـامرازە پێویـستی یـەكانی لەبەشـی كـارگێران دابـین دەكـرێ، بەمـەرجێ نـەتوانرێ لـە سەرچـاوەكانی تـری وەك گەنجینـەی دەوڵـەتو بەخـششو دیاریەكانی جێ بەجێ بكرێ، بەو مەرجەی ئەو پێداویستو كەرەسـانەی پەیوەنـدی راسـتەو خۆیان بە كۆكردنەوەو خەرج كردنـی زەكاتـەوە هـەبێ، یـان بـۆ زیـادكردنی داهاتی زەكاتەكە كاریگەرییان هەبێ .

* چاودێری وبە دوادا چونی لیژنەكانی زەكات لەو لایەنانـەوە كـەدایان نـاون، یـان ڕێیان پێداون دەبێ بكرێ، ئەمەیش بە پەیڕەوی لە كردەی پێغەمبەرﷺ سەبارەت بەوەی كە لە كارگێڕانی زەكاتی دەپرسیەوە .

* كاگێڕی زەكات بەرامبەر بەوەی لە دەسـتیدایە متمانـەی پێكراوە، بۆیـە هـیچ ماڵێكی تیاچـووی پـێ نابـژێردرێ مەگـەر لـە حاڵـەتی دەسـت درێـژی، یـان گـوێ پێنەدانو كەمتەرخەمیدا .

* كارگێڕانی زەكات دەبێت رازاوە بن بەڕەوشتە ئیسلامیەكانی وەك نـەرمو نیـانی لەگەڵ زەكاتدەرانو پێشیاوانی زەكاتدا، وە بەچاوكراوەییو ئاگاداری لە (أحكـام)ی زەكاتو گرنگی زەكات لە كۆمەڵگەی ئیـسلامیدا، لە پێناو بەرپاكردنی گـوزەرانی دەسـتەبەری كۆمەڵایەتی (**التكافل الأجتماعي**) وە بۆ ئەوەی تا لەكانی هـەبوونی پێشیاواندا بە زووترین كات زەكاتەكە دابەش بكـرێ بەسـەریاندا، وە كـارگێڕان بـا دوعای (خێر) بۆ زەكاتدەران بكەن .

## ٤- خەرجگای نۆ مسوڵمانان (والمؤلفة قلوبهم) :

ئەو كەسانەی كە تازە مسـوڵمان بوون زەكاتیـان دەدرێـتێ بەمەبەسـتی پشتگیریو **پتەوبوونیان** لەسەر ئیمانو باوەڕ هێنانیان،وەتابەو زەكاتـە پێداویـستیەكانیان جـێ بەجێ بكە ن وەئەم خـە رج گایـەكافریش دەگرێتـە وەكـە لەگـەڵ زەكاتپێدانەكـەدا

ئومێدی ئیسلام بوونی لێ بکرێ،یان ئومێدی پارێزگاری وبلاوبونەوەی بانگەوازی ئیسلام بەهۆی ئەوەوەلەئارادابێ.

ئامادەبوانی کۆڕی سێ هه م بۆتاوتوێ کردنی کێشه هاوچه رخیه کانی زه کات ئه وپاسانه ی که ده رباره‌ی نۆموسوڵمانان خرانه به رده می لیکۆڵینه وه‌یان تێداکردن وگه یشتنه ئه م ئه نجامانه ی خواره‌وه:

**یەکەم:** خەرجگای (نۆ مسوڵمانان)کە یەکێکە لەهەشت خەرجگاکانی زەکات لەوبڕیارەشەرعیە نەگۆڕانەیە کەسڕینەوەی بەسەردانەهاتوە، وەئەمەش ڕای جەماوەری زانایانی( فیقه)ە.

**دووەم:** لەگرنگترین شوێنی خەرجکردنی ئەم بەشە ئەم مەودایانەی خوارەوەیە:

* دڵڕاکێشانی کەسانێ کەئومێدی مسوڵمان بونیان لێ بکرێ بەتایبەتی کەسانی خاوەن ڕاوقسە ڕۆیشتوو،لەوجۆرەکەسانەی چاوەڕوانیان لێ بکرێ کەسودێکی گەورەیان هەبێ لەبارەی جێبەجێکردنی نەوشتانەوەکەبەرژەوەندی مسوڵمانیان تێدابێ .

* دڵڕاگرتنی خاوەن دەسەلات وگەورە لێپرسراوانی وولات و وێنەیان، بەئومێدی بەشداری کردنیان لەچاککردنی بارودۆخی ژیانی مسوڵماناندا.

* دڵڕاکێشانی خاوەن بیرە بەتوانائیسلامیەکان بۆئەوەی پشتگیری لەکێشەی مسوڵمانان بکەن .

* دروستکردنی دەزگای زانستی وکۆمەلایەتی بۆچاودێری کردنی ئەوانەی کەمسوڵمان دەبن، وەدامەزراندنی دڵیان لەسەر ئیسلامەتی، وەهەمووئەوشتانەی کەدەبنەهۆی ڕەخساندنی کەش وهەوایەکی گونجاو بۆژیانی تازەیان چ لەڕووی بەرزکردنەوەی ورەی هەست ودەروونیانەوە، وەچ لەڕووی ژیانی جەستەیی وداراییانەوە .

**سێیەم:** لەخەرج کردنی ئەم بەشەدا ئەم مەرجانەی خوارەوە رەچاو دەکرێ :

* مەبەست و رامیاریە شەرعیەکان لەبەر چاو بگیرێ بۆ ئەوەی ئەو ئەنجامە شەرعی یانەی دەمانەوێ بێتە دی .

* خەرج کردن فراوان بکرێ، بەس بە گوێرەی پێویست، وە بەئەندازەیەك کە زیان بە خەرجگاکانی تر نەگەیەنێ .

* دوربینی و ووردەکاری بکرێ لە شوێنە خەرجەکاندا، تا نەبێتە هۆی دروست بوونی ئاسەواری خراپ لە روی شەرعەوە، یاخود کاردانەوەیەکی وا دروست بکات لە دەروونی نۆ مسولّماندا کە بەزیانی ئیسلامو موسلّمانان تەواو ببێ .

**چوارەم:** هۆو هۆکارە تازەو پێش رەفتەکان بەکار دەهێنرێن، وە پرۆژەی بە کەلّکترو زیاتر کاریگەر پەسەند دەکرێ بۆ گەیشتن بە مەبەستە شەرعیەکان لە ئەنجامی ئەم خەرج کردنەدا .

## ٥- خەرجگای رزگار کردنی گەردنەکان لە کۆیلایەتی (وفي الرقاب) :

ئەم خەرجگایە دیلو وێنەی دیلیش دەگرێتەوە، چەند مەزنیو شانازی یە بۆ ئایینی ئیسلام کە هەشت یەکی بوجەی زەکاتی تەرخان کردووە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکانو رزگار کردنیان لەبەندی و کۆیلە بوون .

## ٦- خەرجگای قەرزارەکان (والمغارمين) :

کە ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە :

١- کەسانێك قەرزیان کردووەو ئێستا ئەوەندەیان نی یە قەرزەکانیان بدەنەوە.

٢- کەسانێك قەرزیان وەرگرتووە بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی نێوان دوولایەن کە ناکۆك بوون، باخۆشیان بتوانن ئەو قەرزە بدەنەوە .

٣- ئەو کەسانەی کە بەهۆی رووداوی ناخۆش تووشی نەبوونیو بێ دەرامەتی بوون، چونکە کۆڕی دووەمی تاوتوێ کردنی کێشە هاوچەرخەکانی زەکات

فتوای دەرکردووە کە : لە ماڵی زەکات کۆمەکی بکرێ بۆ خوێندانی کوشتنی هەڵە، ئەگەر بکوژەکانی (**العاقلة**) نەیان توانی خوێنەکە بدەن، وە خەزێنەی (بیت المال)یش نەیتوانی خوێنەکە هەڵگرێ، ئەم یارمەتیەش راستەوخۆ دەدرێ بە خزمەکانی کوژراوەکە .

بەڵام لە ماڵی زەکات خوێن کوشتنی بە قەصدی نادرێ تەنانەت کۆڕەکە راسپاردەی داوا دەکات شلگیری نەکرێ لە زەکاتدان بۆ بژاردنی خوێنەکەیان بەتایبەتی لەگەڵ زۆربوونی رووداوەکانو هەبوونی پێویستی زیاتر بۆ خەرجکردنی زەکات لە خەرجگاکانی تردا .

باشتر فتوایەکی گشتگیرو فراوانتر دەربارەی خەرجکردنی زەکات بۆ قەرزاران لە کۆڕی پێنجەم (**الندوة**) دەچووە کە ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی :

**یەکەم:** ئەو قەرزارە موسڵمانە هەژارانەن کە بۆ بەرژەوەندی رەوای خۆیان قەرزار بوون، یاخود بەهۆی کارەساتو پێشهاتی ناخۆشەوە قەرزار بوون .

**دووەم:** ئەو قەرزارە موسڵمانانەن کە بۆ رێکخستنی نێوان دوو لایەنی ناکۆك قەرزار بوون، بۆ هێور کردنەوەی ئاژاوەو گێرو گرفتێ کە لەنێوان موسڵماناندا روونەدا، یاخود بۆ خەرج کردنی لەو کێشەو کارەساتانەی کە توشی موسڵمانان دەبێ وەلەم بەشەدا هەژاری قەرزاربووە کە مەرجی نی یە .

* کەسێك بووەتە دەستەبەر (**ظامن**) ی بژاردنی ماڵێك لەبری کەسێکی نەدارا، دروستە ماڵە دەستەبەر کراوەکەی بدرێتێ ئەگەر کەسە دەستەبەرەکە نەیبوو بیبژێرێ .

* ئەو کەسەی کە بۆ بەرژەوەندی خۆی قەرزار بووە نابێ لە ماڵی زەکاتی بدرێتێ ئەگەر لەپێناوی کارێکی گوناه قەرزار بوویێ وەك مەی، یان قومار، یان سوو خواردن مەگەر تۆبەی لەو گوناهە کردبێو تۆبەکەشی بردبێتە سەر .

* دروستە قـەرزی مـردوو لـە مـاڵی زەکـات جـێ بـەجێ بکرێـت ئەگـەر ماڵـە میراتەکەی بەشـی ئـەو قـەرزەی نـەدەکرد، وەمـیرات گرەکانیـشی قەرزەکـەیان بـۆ نەدایەوە، ئەمیش چـونکە قەرزدانەوەکـە پارێزگـاری لـە مـاڵی خـاوەن قـەرزەکانو رزگاربوونی ئەستۆی مردووەکەی تێدایە .

* ئەو کەسەی بۆ بەرژەوەندی خۆی قەرزار بووە، وە کەسێکی بەتواناو ساغە بـۆی نی یە لە ماڵی زەکات وەربگرێ کاتێ کە بتـوانێ لـە دەسـتکەوتی خـۆی قەرزەکـە بداتەوە، یان خاوەن قەرز مۆڵەتی دابێ بۆ کاتێ هەیبێ .

هەروەها کەسێکیش داراییەکەی هەبێ کەبتوانێ قەرزەکەی لێبداتەوە، چ پـارە بـێ یان خانوو یان هەرشتێکی تر .

* ئەو کەسەی کە بەهۆی قەرزارییەوە زەکاتی وەرگـرت ئـەبێ تـەنها لـە دانـەوەی قەرزەکە خەرجی بکات .

* قەرزاری هەژار بۆ زەکات پێدان باشترە لە تەنها هەژار وە کەم دەستی قەرزار بۆ زەکات پێدان باشترە لە تەنها کەم دەست، چونکە ئەو دووانـە قـەرزاریو هـەژاریی یان کەم دەستیان تیا کۆبووەتەوە، بەڵام رووداوەکانی تـر تـەنها هـەژارییان تێدایـە یان کەم دەستی:

* قەرز بژێر دروستە بە ئەندازەی قەرزەکەی بـدرێتێ زۆربـێ یـان کـەم، بەمـەرجێ ماڵە زەکاتەکە بەقەرزەکەدا دەگەیـشت، خـۆ ئەگـەر قـەرزار بـەر لـەوەی قەرزەکـە ببژێرێ دەوەڵەمەند بوو لەسەریەتی ئەو ماڵە کـە وەریگرتـووە .. ئەگـەر نـەیتوانی بۆیانی بگێڕێتەوە ئەوا بیدا بەیەکێ لە خەرجگاکانی زەکات .

* دروستە قەرز بژێر لە ماڵی زەکـاتی بـدرێتێ بـۆ ئـەو سـاڵەی قەرزەکـەی کـاتی دانەوەیەتی باچەند مانگێکیشی مابێ بۆ کاتی دیاری کراوی قەرزدانەوەکـە، بـەڵام نایدرێتێ بـۆ دانـەوەی قـەرزی سـاڵی ئاینـدە مەگـەر لـە حاڵەتێکـدا خـاوەن قـەرز

لەگەڵیا ڕێک کەوتبێ، ئێستا قەرزەکەی بداتەوە هەندێ لەقەرزەکەی بۆ دادەشکێنێ .

* کەسێك داهاتێکی هەبێ کە بەشی بکات بۆی نی یە قەرز بکات بۆ دانانی کارگەیەك یان کێڵگەیەکی کشتوکاڵ، یان شوێنێك بە ئومێدی ئەوەی لە ماڵی زەکات قەرزی بۆ بدەنەوە، چونکە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی هەژاران، یان بەرپاکردنی داهاتێك کە پێداویستی هەژاران یان بەرپاکردنی داهاتێك کە پێداویستیان پڕبکاتەوە هاتوەتە گۆڕێ، وەنادرێ بە کەسێ بەشی بەش کردووی خۆی هەبێ بۆ ئەوەی زیاتری دەست کەوێ .

* خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ کە قەرزار بوون لەم خەرجگایەیان دەدرێتێ، ئەگەر ئەو مافانەی لەشەرعدا هەیانە لێیان بڕا .

**٧- خەرجگای لەڕێگای خوادا (وفي سبيل الله):**

زانایانی (تفسیر)و(فقه) بۆچوونیان لەم بارەیەوە سێ جۆرە:

**یەکەمیان:** مەوداکەیان فەراوان کردووە .

**دووەمیان:** مەودایان کورت کردۆتەوە تەنها بۆ غەزا.

**سێیەمیان:** رای ناوەندییە .

فتوای کۆڕی یەکەمیش بۆ تاوتوێ کردنی کێشە هاوچەرخەکانی زەکات دەرچووە، کە ئەمە دەقەکەیەتی :

مەبەست لە (وفی سبیل الله) جیهادە بە مەبەستە فراوانەکەی جیهاد، کە زانایانی (فقه) بڕیاریان لەسەر داوە، کە ئەمەش هەموو ئەم مەودایانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

أ- پارێزگاری ئایینو بەرزکردنەوەی وشەی خوا.

ب- غەزاو جەنگ کردن لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا .

ج- ڕاگەیاندنی ئیسلامو بانگکردن بۆی.

د- کارکردنو هەوڵدان بۆ حاکم بوونی بەرنامەی ئیسلام.

هـ- ڕەتکردنەوەی ئەو گومانو تانەو تەشەرانەی کە دوژمنانی ئیسلام دژ بە ئیسلام بڵاوی دەکەنەوە.

و- بەربەستکردنی هێرشەکانی دژ بە ئایینی ئیسلام.

**بە پێی ئەم بۆچوونە جیهاد بریتی نی یە تەنها لە چالاکیی سەربازی، جیهاد بەمانا فراوانەی ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە :**

١- دابین کردنی ماڵ بۆ بزاڤە ڕزگاریخوازە موسڵمانەکان کە لە پێناو سەربەخۆیی گەلەکانیاندا خەبات ئەکەن بۆ بەدەست هێنانی ئازادی، وەك بزووتنەوەکانی فەلەستینو کشمیرو فلیپینو کوردستانو .... هتد.

٢- پشتگیری کردن لەو هەوڵە تاكو بەکۆمەڵانەی کە دەیەوێ بەرنامەی ئیسلام دوبارە بێتەوە سەرشانۆی ژیانو، بەرنامەی خوا لە وڵاتانی موسڵماندا پییادەببێو، بەرگری پیلانەکانی دوژمنانی ئیسلام بکەن کە دەیانەوێ بیرو باوەڕی ئیسلام لە ئارادا نەهێڵنو بەرنامەکانی لە فەرمانڕەوایی وەلابخەن .

٣- دابین کردنی ماڵ بۆ مەڵبەندەکانی بانگکردن بۆلای ئیسلام، ئەو بانگەوازەی کەپیاوانی ڕاستو ڕاستگۆ لە دەرەوەی وڵاتانی ئیسلام پێی هەڵدەسن بە ئومێدی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەو ڕێگا ڕاستو دروستانەی کەلەگەڵ سەردەمدا دەگونجێت، ئەمیش ئەو مزگاوتانە دەگرێتەوە کەلە وڵاتە نائیسلامیەکاندا دەکرێنەوە بۆ ئەوەی ببنە بنکەی بانگەوازی ئیسلام .

٤- بەخشینی ماڵ بۆ ئەو گورجو چالاکانەی کەدەدرێت بۆ جێگیربوونی ئیسلام لە نێوان کە مایەتی یە ئیسلامی یەکاندا لەو وڵاتانەی کەسانی نا موسڵمان زاڵ

بوون بەسەر موسڵماناندا، هەروەها ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە بەر نەخشەیەك کە کێشراوە بۆتواندنەوەو نەهێشتنی پاشماوەی موسڵمانان لەو وڵاتانەدا .

### ٨- خەرجگای ڕێبوار ( أبن السبيل ) :

مەبەست ڕێبوارێکە لەرێ دابڕاوەو بە هیچ لایەکدا ناتوانێت بڕوات، چونکە ماڵی لە دەستدا نەماوە کە پێی بگاتە ئەو جێگایە کەبۆی دەڕوات، یان دەستی ناگاتە ماڵو دارایی خۆی.. جا لەماڵی زەکاتی دەدرێتی کە پێی بگاتە ئەو شوێنەی بۆی دەڕوات، یان ئەو جێگایەی کە ماڵی خۆی لێیە، با دەوڵەمەندیش بێت، تەرخان کردنی بەشێکەلە ماڵی زەکات بۆ ڕێبوار ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم ئیسلامە چەند گرنگی بە هاتۆچۆو گەشتو گوزار دەدات، چ بۆ پەیداکردنی بژێوی، وەچ بۆ زانیاری، یان جیهادو حەجو وێنەیان، لەوانەی کەلە ئیسلامدا داوای کردنیان کراوە.. لە هەمانکاتیشدا شێوەیەکە لە دەستەبەریی ئیسلامی (التكافل الاسلامی)و، چاودێری لە وڵات دابڕاونو لەپێ کەوتوانی ڕێگایە، چونکە ئەوەتە دەستەبەری ماڵی بۆ کردوون کەبیانگەیەنێتە ئەو شوێنەی بۆی دەڕۆن، جێگا خەرجی (ابن السبیل) ئەوانەش دەگرێتەوە کە دەیانەوێ سەفەر بکەن بۆ بەرژەوەندی یەك کە سودو کەڵك بە ئایینی ئیسلام یان کۆمەڵێکی موسڵمان بگەیەنێ، وەك ئەوە کەسانێك بنێرێن بۆ وەدەستهێنانی زانستێك، یان کارو فرمانێك کە وڵاتێکی ئیسلامی پێویستی پێی هەبێ، ئەمەیش بۆچوونی شافیعیەکانە ئەوانەی رایان وایە کە (ابن السبیل) دەستپێکردوانی سەفەریش دەگرێتەوەو، دروست کردنو شوێنو ماوەی تایبەت بۆ ڕێبوارانو لە وڵات دوورکەوتووان دەکەوێتە بەر گشتگیری (ابن السبیل) کە ئەمیش کارێکە خولەفای ڕاشدین کردوویانە .

## چەند بابەتێکی گرنگ :

ئایەتی هەشت خەرجگاکەی زەکات پیتی (ال)ی بۆ چوار ریزی یەکەم بەکارهێناوە، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کە چوار ریزی یەکەم دەبێ زەکاتەکە بکرێتەماڵی تایبەتی خۆیان، بەڵام چوار ریزی دووەم مەرج نی یە بکرێ بە ماڵی تایبەتی خۆیانو تەنها بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکە مەبەستە:

١- دروست نی یە زەکات بدرێت بەبنەچەو وەچەی مرۆڤ واتە (باوكو دایكو کورو کوڕەزاو کچو کچەزا)، هەروەها دروست نی یە بدرێ بەبنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ هەروەها دروست نی یە بدرێ بە دەوڵەمەندان یان بەکافرانو بێ باوەڕانو یان ئەوانەی کە لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە (المرتدین)و یان ئەوانەی کەبەرامبەر بەئیسلام دەجەنگنو هەروەها زەکاتی مێرد بۆ هاوسەرەکەی خۆی دروست نیە.

٢- ئەگەر زەکات دەر لەدوای زەکاتدانەکە بۆی دەرکەوت ئەوەی زەکاتەکەی داوەتێ شایستەی زەکات پێدان نیە دەبێ چی بکات؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا زانایانی (فقه) جیاییان هەیە، رای پشتگیری کراویان ئەوەیە کەئەگەر زەکاتدەرەکە توانای خۆی خستەکار بۆ دۆزینەوەی پێ شیاوی زەکاتەکەو بەڵام هەڵەی کرد ئەوە هیچی لەسەر نی یە، چونکە توانای هەر ئەوەندەیە، بەڵام ئەگەر لە دۆزینەوەی پێشیاودا کەمو کوڕی کردو، لای گرنگ نەبوو زەکاتەکە بەکێ دەدا، ئینجا هەڵەی کرد، ئەوە لەسەری دەکەوێتو دەبێ زەکاتەکەی دووبارە بکاتەوە، بە کەسێکی بدات کە پێشیاوی زەکات بێ .

# زەکاتی سەرفیترە

## (زكاة الفطر)

ئیبن عومەر (خوای لێ رازی بێت) گێڕاوێتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ زەکاتی سەرفیترەی بڕیارداوە (صاع) ێك بێ لە خورما، یان لە جۆ لەسەر هەموو موسڵمانێك، چ ئازادبێت، یان کۆیلە، نێر بێ یان مێ کە بگاتە کاتی ئاوابوونی رۆژ لەدواترین رۆژی مانگی رەمەزان کە دەکاتە شەوی جەژن.. جا دەبێ ئەم زەکاتە بدا لە باتی خۆیو، لە باتی ئەوانەی کە بژێوی لەسەریانە، وەك هاوسەرەکەیو منداڵەکانیو دایكو باوکی (کە ژیواریان لەسەر ئەوبێ).. کەواتە سەرفیترە لەسەر یەك بەیەکی مسوڵمانانە، بچوك بێ یان گەورە، نێربێ یان مێ، هەژاربێ یان دەوڵەمەند، .. ئەندازەکەشی (صاع) ێکە لەجۆری خواردەمەنی زۆریەی هاوڵاتیان، کەپێوانەیەکە بە کێشانەی سەردەمی ئێستامان دەکاتە (٢,١٥٦ کغم) دوکیلۆو سەدو پەنجاو شەش گرام گەنم بەنرخی قەتەر و خەلیج ئێستا دەکاتە (١٥) ریاڵی قەتەری، واتە نزیکەی (٤,٥) چوار دۆلارو نیو.

بەپێی وتەی بەهێز لەوتەی زانایان دروستە لەباتی خواردەمەنی نرخەکەی بدرێو، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بنێردرێ، بەرچاوکردنی بەرژەوەندی یەك تێیدا.

سەرفترە دەبێتە هۆی پاکردنەوەی رۆژوو گرتنەکە لە شتی بێ سودو قسەی نابەجێو، دەوڵەمەند کردنی هەژارو کەم دەستەکان، تا پەنا نەبەنە بەر داوا (سواڵ) کردنو، خۆشی دەخاتە دڵیانەوە لە رۆژی جەژندا، کە ئەمیش ئاوڕدانەوەیەکی پاكو جوانە کەئاینی ئیسلام رەچاوی کردووە، بۆ ئەوەی هەموو کەس هەست بەخۆشیو دڵشادی بکات لەرۆژی جەژنداو، هاوبەشیو تەباییو یەکگرتنێکی ئیسلامییانەی بەهێزو پتەوە.

ئەمەو خوازاناترەو، هەرخۆیەتی کەکردەوەمان پاك دەکاتـەوە، تـا تـەنها بـۆ خـۆی بێت و بەس، دەمانپارێزێ لەهەڵەو خلیسکان لەبیرو باوەڕو وتەو کردار.

**کۆتایی**